# ئەمریکا بناسە

AMRIKA BNASA

ئامادەکردنی :

عبدالرحمن الکوردی

ABDOLRAHMAN ALKURDI

پێداچوونەوەی

کۆمەڵی رزگاربوو



**پێشەکی:**

**یەکێك لە دوژمنە هەر سەر سەختەکانی ئیسلام و مرۆڤایەتی لەم ڕۆژگارەی ئێستا کە تیایدا ئەژین بریتیە لە ئەمریکا، بەڵێ ئەمریکا!!!!.**

**ئەو ئەمریکایەی کە هەزاران موسڵمانی شەهید کرد لە ئەفغانستان و عێراق.**

**ئەو ئەمریکایەی کە مێژوویێکی ڕەش و تاریکی هەیە لە دێر زەمانەوە،**

**ئەو ئەمریکایەی کە کێشە و ئاژاوە لە هەر شوێنێك ڕوودات پشکی ئەوی تیایە.**

**ئەو ئەمریکایەی کە ملیۆنان کەسی لە هیندییەکان کوشت بەناوی شارستانیەت.**

**ئەو ئەمریکایەی کە ملیۆنان کەسی کوشت لە ڤێتنام.**

**ئەو ئەمریکایەی هەزاران کەسی ئەشکەنجەداوە لە زیندانەکانی(گوێنتانامۆ و ابو غریب و هتد ...).**

**ئەو ئەمریکایەی کە خۆی سەپاندووە بەسەر خەڵك و ڕۆژانە لە گشت شوێنێك بە بەرچاوی دونیاوە موسڵمان ئەکوژێت .**

**چەندان تاوانی تر کە نایێنە ژماردن کە مێژوویێکی ڕەش و تاوانکارییە بەرامبەر هەموو دونیا و موسڵمانان بە تایبەتی، وە ئەمریکا لەم ڕۆژگارە بووە بە بت و ڕەمزێك کە چەندان کەس لە هەموو شوێنەکان ئەیپەرستن ، وەبووە بە پەرستراوی زۆربەی دوڕوو و بێ دین و عەلمانیەکان و گوێڕایەڵی و بەندایەتی بۆ ئەکەن و لاملی ناکەن لە فەرمانەکانی.**

**بەڵام سوپاس بۆ خوا موسڵمانانێکی سەر ڕاست و دەست پاك ماون لە هەموو ڕۆژگارێك کەلە ناو خراپە و فیتنەکان بەردەوام و دامەزراون لەسەر بەرنامەکەیان و تەنها خوا ئەپەرستن و گوێڕایەڵی خوای پەروەردگارن و تەنها خوا بە گەورە دائەنێن**

و بەرامبەر گەورەترین دڕندەی سەر زەوی وەستاون و بەردەوامن لە تێکۆشان و خزمەت کردن بە ئیسلام، وە لە لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسن وەکو خودا وەسفیان ئەکات(ولا يَخافون لَومَةَ لائِم)، چونکە ئەمە سوونەتی خوایە کە هەر پێغەمبەرێك هاتبێت گەمە و گاڵتەی پێکراوە بە هەمان شێوە ئەو کەسانەی لەسەر ڕێگای پێغەمبەران بڕۆن هەمان ئازار و ناڕەحەتیان تووش ئەبێت، وە ئەو جۆرە موسڵمانانە گەورەترین ئومێد و هیوایان شەهیدییە و گەڕانەوەیە بۆ لای خوا بە سەربەرزی یان سەرکەوتن و جێبەجێکردنی حوکمی خوا لەسەر زەوی، خوا بە پێغەمبەر(ﷺ)ئەفەرمووێ کە با کافرەکان بڵێ:(قُل هَل تَربَّصُون بِنا إلا إحْدى الحُسْنيَيْن ونَحنُ نتربَّص بِكُم أنْ يصيبَكُم الله بِعَذاب مِن عِنْده أو بِأيْدينَا فَتربَّصُوا إنَّا مَعكُم مُتربِّصُون) واتە:(پێیان بڵێ:ئایا چاوەڕوانی چی دەکەن بۆ ئێمە جگە لە دوو شتە زۆر چاکەکە(سەرکەوتن یان شەهید بوون)، وە ئێمەش چاوەڕوانین بۆ ئێوە کە خوا دووچاری سزایەکتان بکات لەلایەن خۆیەوە یان بە دەستی ئێمە، کەواتە چاوەڕوانی بکەن بێگومان ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا لە چاوەڕوانین).

ئەم کتێبە چەند تنۆکێکی کەمە لە دەریای پڕ تاوان و دڕندەیی ئەمریکا، کە خەڵکانێکی موسڵمانی ساویلکە ئەبینین هەڵخەڵەتاون بە ڕۆژئاوا و ئەمریکا بە تایبەتی وە پێیان وایە ئەمریکا فریشتیەکی بێ تاوان و سەرخەری ستەملێکراوانە، وە وا گومان ئەبەن پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی تەنها لە ولاٌتانی ئەوروپا و ئەمریکا بە دەست ئەکەوێت، وە ئەم کتێبە مێژووی ڕەشی ئەمریکا ئەخاتە ڕوو کە ئەم ولاٌت و شارستانیەیان لەسەر خوێنی ملیۆنان کەس بنیات ناوە بە ناڕەوا، وە لەهەموو لایەنەکان نغرۆی تاوان و سنوور دەرچوون بوونە، وە ژیانێکی بێ ئامانج ئەبەنە سەر و ڕۆژانە و ساڵانە هەزاران کەس کۆتایی بە ژیانی خۆی ئەهێنێ، وە هەزاران ئافرەت تووشی دەستدرێژی جینسی ئەبنەوە، وە هەزاران تاوانی کوشتن و دەستدرێژی و تاوانی جۆراوجۆر ڕووئەدات، وە بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەمریکا چەند دژی ئەو دروشمانەیە کە بانگەشەی بۆ ئەکات لە پاراستنی مافەکان مرۆڤ و ئازادی، وە ئەبینین دژایەتی و کوشتاری هەموو کەسێکی کردووە کە ژێرباری ئەو نەبووبن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەبوبێت،(هەمووئەمانت لەم کتێبە بۆ ڕوون ئەبێتەوە).

## خۆشەویستی و پشتیوانیت بۆ کێیە!!!!

خوا ئەفەرمووێ:(ما جَعل الله لِرجُل مِن قلبين في جَوفِه)ناکرێ موسڵمان کە خۆی بە ئیماندار ئەزانێ کەمترین خۆشەیستی و وەلائی بۆ ئەمریکا و وڵآتانی کوفر هەبێت، چونکە خۆشەویستی و سەرخستن بنچینە و کرۆکی یەکتاپەرستی و تەوحیدە، موسڵمان ئەبێت تەنها پشتیوانی و دەستباری موسڵمانانی برای بێت لە هەر کوێیەك بێت و بە هەر زوبانێك قسە بکات، تا ئیماندار بێت و پابەندی ئیسلام بێت برامانن خوێنیان خوێنمانە و ئازاریان ئازارمانە و خۆشیان خۆشیمانە، ئەمەیە ئیسلامی ڕاستەقینە و ڕێگا و ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ)، خوا دەفەرمووێ:(إنَّما المُؤمِنونَ إخْوة)واتە:(تەنها ئیماندار برای ڕاستەقینەی یەکترن) وە پێغەمبەر(ﷺ)ئیمانداری شوبهاندووە بە یەك لاشە و جەستە(کمثل جسد واحد).

کەواتە پەیوەندی برایەتی ئیمانی بەهێزترین پەیوەندییە لە نێوان موسڵمانان ئەبێت بەردەوام لەیادمان بێت کە تەنها ئیماندار برای ڕاستەقینەی ئیمانداره.

وە بە پێچەوانەوەش دژایەتی و ڕقابەرایەتی هەموو کەسێك بکەین کە دژایەتی خوا و پێغەمبەر ئەکات و بێ بڕوایە بە خوا ئینجا باوکمان بێت یان دایکمان یان برامان یان خزم و کەسە نزیکەکانمان، تا دژایەتی خوا بکەن ئەوان دوژمنی ئێمەن خوا دەفەرمووێ:(يأيُها الذِين آمَنوا لا تَتَّخِذوا عَدوي وعَدوَّكُم أولياء)واتە:(ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە دوژمنی من و دوژمنی خۆتان مەکەن بە دۆست و خۆشەویست) کەواتە نیشانەی ڕاستی ئیمان بریتیە لە دووری و پشتهەڵکردن لە کافر و بێبڕواکان هەر بۆیە ئەبینین هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لەم بابەتە زۆر چاك تێگەیشتبوون و درکیان بەم شتە کردبوو بۆیە لە شەڕ و غەزاکان هاوەڵی وا هەبوو باوکی خۆی ئەکوشت[1]، هەبوو برای خۆی ئەکوشت[2]، هەبوو خزم و کەس و کاری خۆی

---

[1] وەك:(أبي عبيدة)لە شەڕی بەدر(الجراح)ی باوکی خۆی کوشت.

ئەکوشت[3]، کەواتە ململانێکە لە نێوان حەق و ناحەقە، لە نێوان ئیسلام و کوفرە، ئەو کەسەی لە بەرەی کوفرا بێت دوژمنی ئێمەیە ئینجا هەرکەسێك بێت و هاوزوبان و نزیکترین کەسیشمان بێت، ئەمە ئەو بیروباوەڕیە کە پێغەمبەر(ﷺ)هاوەڵانی لەسەر پەروەردەکرد.

وەخوای پەروەردگار ئاگادارمان ئەکاتەوە لە ترسناکی پشتیوانی و دۆستایەتی بێ بڕوایان ئەفەرمووێ:(ومن يَتولَّهُم مِنكم فإنَّه مِنْهُم)واتە:(وە هەرکەسێك دۆستایەتیان لەگەڵ بکا و بیانکات بە یارمەتیدەر و دۆستی خۆی  بێ شك ئەو کەسە لەوانە و بەوان دادەنرێ ).

وە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ:(المرء مع من احب)واتە:(مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسە دایە کە خۆشی دەوێت)

وە ئەبێت بەردەوام لە یادمان بێت کە هەرگیز کافر و بێبڕواکان لە موسڵمان ڕازی نابن و خۆشیان بە موسڵمان نایێت،بەڵی، بەڵام چ جۆرە  موسڵمانێك، ئەو موسڵمانەی کە قورئان باسی کردووە، نەوەك ئەو موسڵمانەی کە لە ڕۆژگاری ئێستا تەنها بە دروشم و ناسنامە موسڵمانە و ئیسلام لێی بەرییە و پەیڕەوی دەستوور و شوێنکەوتووی ئەمریکا و وڵاتانی کوفرە، وەك ئەوترێت:(الإسلام على طريقة امريكية)ئەم جۆرە کەسانە دۆست و خۆشەویستی ئەمریکا و کافرانن، بەڵام موسڵمانی ڕاستەقینە وەك خوا باس ئەکات کە هەرگیز گاور و جولەکە ڕازی نابن تاوەکو شوێن دینەکەیان نەکەون ئەوەتا ئەفەرمووێ:(ولَن تَرضَى عَنكَ اليَهود ولا النَّصارى حَتَّى تتَّبِعَ مِلَّتَهم)واتە:(هەرگیز جولەکە و گاور لێت ڕازی نابن تاوەکو شوێن ئاین و ڕێبازەکەیان نەکەویت)

---

[2] وەك:(مصعب بن عمير)کە براکەی(عبيد بن عمير)ی کوشت لە شەڕی بەدر.
[3] وەك(حمزة و علي و عبيدة بن الحارث)کە(عتبة و شيبة و وليد بن عتبة)یان کوشت لە شەڕی بەدر.

كەواتە ئەی خوێنەری بەرێز خۆت هەڵسەنگێنە ئایا كافر و بێبڕوا و عەلمانییەكان خۆشیان بە كەسانی وەك تۆ دێت یان نا!!! ڕازین لە كەسانی وەك تۆ یان نا!!!

وەهەروەها سەركردەكانی ئەمریكا و وڵاتانی كوفریش ئەمەیان بە ئاشكرا وتووە كە ئەو كەسەی لەگەڵیان نەبێت و پشتیوانیان نەبێت ئەوە دوژمنیانە، ئەوەتا (جۆرج بۆش) دوای داگیركردنی عێراق ڕایگەیاند و ووتی:(من لم یكن معنا فهو ضدنا)واتە:(ئەوەی لەگەڵ ئێمە نەبێت ئەوە دژی ئێمەیە)

كەوابوو ئەمریكا سیاسەتی تاك ڕەوی جێبەجێ ئەكات كە تەنها ئەبێت خۆی قەڵەمڕەو بێت و فەرمانەكانی ئەو جێبەجێبكرێت.

كەواتە ئەی موسڵمان و یەكتاپەرست خۆت یەكلایی بكەوە ئایا لەگەڵ ئەمریكای یان دژ بە ئەمریكای؟؟!!!!!گوێڕایەڵی ئەمریكای یاخود گوێڕایەڵی خوای پەروەردگاری!!!!!پشت بەستن و ئومێدت بە ئەمریكایە یاخود بەخوای بە توانا و بەهێزە!!!؟؟دڵت پەیوەستە بە ئەمریكا یاخود بە خوای گەورە؟؟؟!!!!!

## ئەمریكا كێییە؟؟؟؟!!!:

- ئەمریكا دەستەواژەیەك بۆ خوێن ڕشتن و كاولكاری و دواكەوتووی.
- دەستەواژەیەكە لە دژایەتی موسڵمانان و ئیسلام.
- دەستەواژەیەكە لە خۆسەپاندن و تێكدانی وڵاتان.
- دەستەواژەیەكە لە پێشێلكردنی مافەكانی مرۆڤ بە گشتی و موسڵمان بە تایبەتی.
- دەستەواژەیەكە كۆكەرەوەی هەموو ماناكانی خراپە و تاوان ئەچێتە ناوی.

(ئەم كتێبە هەموو ئەم قسانەی كردمان بۆت ئەسەلەمێنێت)

شێخ (ناصر الفهد) خودای گەورە لە زیندانی (آل سعود) ئازادی بکات لە کتێبی (التبيان في كفر من أعان الأمركيان) دەربارەی ئەو کەسانەی پێیان وایە ئەمریکا وڵاتێکی پێشکەوتوو و شارستانییە ئەفەرمووێ:

(ئەمریکا تەنها لە شەڕی ڤێتنام لە ساڵی ١٩٦٣ (١٦٠ هەزار)کەسی کوشت، وە(٧٠٠هەزار)کەسی بەس ئەشکەنجەدا، وە(٣١هەزار)ئافرەتی اغتیصاب کرد، وە کلیەی(٣٠٠٠)کەسی دەرهێنا، وە(٤٠٠٠)کەسی بەس سوتاند، وە(٤٦)گوندی بەس بە کیمیاوی لەناو برد).

ئایا کام پێشکەوتن و مافی مرۆڤ کە ئەمریکا باسی ئەکات، بەڵکو هەڵخەڵەتاندی کەسانێکی گەوج و نەفامە.

وە شێخ (عبدالله عزام) دەفەرمووێ:(خلاصة أمريكا عبارة عن مجموع اللصوص والأشرار في أوروبا الذين نبذهم مجتمعهم فهاجروا ، عبارة عن شذاذ الآفاق هاجروا إلى العالم الجديد بعد أن اكتشفها كولمبس ، ووجدوا شعباً يعيش في أرضٍ جديدةٍ ، فبدأوا به تمزيقاً وتقتيلاً وأفنوه ، ولم يبق منه إلا بضعة ملايين ، سواء من الهنود الحمر أو من الأسبانيين في كولورادو وأنديانا وغيرها ، أبقوا بقية باقية عبارة عن ماذا ؟ عبارة عن متاحف ، عبارة عن قطعٍ قديمةٍ يراها الزائرون لأمريكا)[٤]

واتە:( پوختەی ئەمریکا:دستەواژەیەکە لە کۆمەڵێك دز و چەتە و خراپەکار لە ئەورووپاوە کۆچیان کرد و لای کۆمەڵگاکەی خۆیان بێزلێکرا و فرێدراوبوون ، وە دەستەواژەیەکە لە شاز و ڕیزپەرەکانی هەموو شوێنێکی دونیا کە کۆچیان کردووە بۆ ئەو ناوچە نوێیەی کە(کولمبس)دۆزیەوە، وە بینیان میللەتێکی نوێ لەسەر ئەم زەویە دەژین(کە هیندیەکان بوون) بۆیە دەستیان بە کوشتن و بڕین کرد تەنها چەند ملیۆنێك لە هیندیە سورەکان و ئیسپانیەکان لە (کولارادو) و (اندیانا) و چەند شوێنێکی تر مانەوە، خەڵکانێکی زۆر کەم مانەوە و ڕزگاریان بوو!!!!!وە بوون بە

[٤] خربت امريكا: لأبي جندل الأزدي

دەستەواژەیەك لە ئاسەوار و پارچە کۆنەی سوتێندراو کە گەشتیاران لەکاتی سەردانیکردنی ئەمریکا ئەیبینن و سەیری ئەکەن).

وە دکتۆر (عبدالعظيم محمود الديب)° ئەفەرمووێ:(هەرکەسێك مێژووی ئەوروپا بخوێنێتەوە ئەگات بە چەندین تاوان و خراپە و کارەسات کە ئەگەر دلۆپێکی بکەوێتە ناو دەریای مێژووی ئێمە پیس و لێڵی ئەکات و ڕەنگاوی ئەکات بە ڕەش و تاریکی، بەڵام ڕۆژئاوا توانیویەتی خۆی لەم مێژووە دەربێنێ بە ڕەنگێکی ئامۆژگاریکار خۆی ناساندووە بە ڕۆڵەکانی، تا وای لێهاتووە بەشێك لە ئێمە شانازی ئەکات بە کەسایەتیەکانی مێژووی ئەورووپا).

## بۆ باسی تاوانکاری ئەمریکا بکەین؟؟؟!!!!!

هەموو شتێك بۆ ئەوەی بۆمان دەرکەوێت چییە و چۆنە ئەبێت بزانین مێژو و ڕەوڕەوی ئەم شتە چیە و چۆنە، وە بمانەوێ شارستانی و پێشکەوتنی هەر ولاتێك بزانین ئەبێت مێژووی ئەم ولاتە شارەزا بین ئەوەتا شاعیر ئەڵێت:

اقرأوالتاريخ إذا فيه العبر      ضل قوم ليس يردون الخبر

واتە:(مێژوو بخوێننەوە سوودی تیایە، خەڵکانێك سەریان لێشوا کە هەواڵەکانیان نەگەڕاندەوە).

– بۆ ئەوەی زیاتر دڕندەیی و تاوانکاری ئەمریکا و ولاتانی ئەوروپامان بۆ دەرکەوێت کە چیان کردووە بەرامبەر هەموو خەڵك و موسڵمانان بە تایبەتی بۆ ئەوەی ڕق و توڕیی بەرامبەریان بەردەوام لەناو دڵمان پەنگ بخواتەوە تا ئەو ڕۆژەی لە مەیدانی جەنگ پێیان ئەگەین شەڕێکی وا بکەین کە پاشەکشە و گەڕانەوەی تیا نەبێت.

° مامۆستا و سەرۆکی بەشی فیقە و اصول لە کولیەی شەریعە لە زانکۆی قەتەر.

– وه بۆ ئەوەی لەم ڕۆژگارەی ئێستاش هەڵنەخەڵەتێین به دروشم و چەواشەکاریەکانی خۆیان و نۆکەرەکانیان، که به هەموو ڕێگایەك خەڵکیان فریو داوه و خۆیان به ئامۆژگاریکار و ئاشتی خواز دەردەخەن و موسڵمان و یەکتاپەرستانیش به توندڕه و تێکدەر و خراپەکار وێنا ئەکەن.

– وه بۆ ئەوەی بیروباوەڕمان به تەواوی دامەزرێ بێ هیچ پاشگەز و دوودڵیەك پشتیوانی و کۆمەکیمان تەنها بۆ ئیماندارانی براکانمان بێت، وه تورەیی و ڕق و قینەشمان له هاوبەشدانەران و بێبڕوایان بێت، چونکه عەقیده و بیروباوەڕ کرۆك و ناوەڕۆکی هەموو شتێکه وەك ڕەگی دار وایه بۆ مرۆڤ تاوەکو بەردەوام بێت لەسەر ئاینەکەی و دوولی و گومان ڕووی تێنەکات.

باسکراوه که شاعیری جاهیلی(ابا ليلى المهلهل التغلبي)کاتێك براکەی(وائل بن ربيعة)کوژرا، لەلای گۆڕەکەی دادەنیشت و ئەگریا، به شەو و ڕۆژ لەلای گۆڕەکەی ئەماوه و تەنها ئەگریا، کوڕانی قەومەکەی سەرزەنشتیان کرد چونکه(ابا ليلى) یەکێك بوو له سوارچاك و پێشەوا ئازاکان بۆ تەنها ئەگریی و ناتوانی تۆڵەی براکەی بکاتەوه!!!؟؟؟؟ بۆیه بێ هیوا بوون لێی، وه هەندێکیان تۆمەتبارین کرد بەوەی که وەك ئافرەت ڕۆڵه ڕۆڵ و شین و شەپۆر ئەکات و ئەگری، له پاش ئەوەی لێی بێ هیوا بوون له ڕۆژێك بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو(أبا ليلى) جلی شەڕی لەبەر کرد، وه دڵی پڕبووبوو له تورەیی و ڕق و قینه له تیرەی(بکر)ئەیوست بەهەرشێوەیەك بێت لەناویان بەرێت، به غەیری ئەم زوبانه هیچی تری نه ئەوت.

وه باس ئەکرێ که(حارث بن عباد) گەورەی(بني يشكر)له له شەڕی (بکر) دوورکەوتەوه، کاتێك (ابو ليلى المهلهل) (بجير)ی کوڕی کوشت، زۆر گریا لەسەری، وه زۆر شیعر و قەسیدەی لەسەر ئەووت، وه هەموو شەوێك ئەچووه سەر گردێکی بەرز که ئەیڕوانیه سەر ماڵی(ابي ليلى) و سەیری ئەکرد و ئەگریا، کاتێك پرسیاریان لێکرد ووتی:( أريد أن يمتلئ قلبي غضبا عليه حتى إذا حاربته لا يقف في وجهي شيء)

واتە:(ئەمەویٚ دڵم پڕ بێت لە توڕەیی تا کاتێك شەڕم کرد هیچ شتێك بەرەو ڕووم نەوەستێت)واتە تووشی گومان و بیٚ وورەیی نەبم و هەموو هەوڵێکم بۆ لەناوبردنی بێت.

ئەمانە دوو پێشەوای جاهیلی بوون کە خۆیان ئامادە ئەکرد بۆ ڕووبەڕوبونەوەی دوژمن بە دڵ پڕ قین و توڕەیی، بۆیە گەیشتن بەو ئامانجەی کە مەبەستیان بوو.

(مهلهل) توانی تۆڵەی خۆی بکاتەوە لە(بکر) کوشتار و سەربڕینێکی زۆری لەناو کردن، وە (حارث) یش لە ڕێگای قەومەکەی توانی (ابا ليلى المهلهل)بشکێنێت و تووشی شکستێکی گەورەی بکات.

وەهەروەها ئەگەر سەیرێکی کتێبە مێژوویەکان بکەین ئەبینین بێبڕوایان چەندین ڕێگا و شێوازیان بەکارهێناوە بۆ زیادکردن و هاندانی خەڵك و موریدەکانیان دژ بە ئیسلام، ئەوەتا(ابن الأثير)لە مێژووەکەی خۆی باس ئەکات:

کە خاچپەرستان وێنەی پێغەمبەر عیسا و محمد(عليهما السلام) یان کێشابوو کە لە وێنەکەدا پێغەمبەر محمد لە پێغەمبەر عیسا ئەدات تا خوێنی لەلاشە ئەهێنیٚ، وە هاتن و ئەم وێنەیان ئەگێڕا بەناو خەڵکانی ئەورویی و ئەیانووت:محمد پێغەمبەری عەرەبان لە پێغەمبەری ئێمە(يسوعا) ئەدات تا خوێنی لیٚ ئەهێنیٚ، بەم ڕێگایە ویستیان خەڵك ڕق و قینی لا دروست بێت بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان، تاوەکو باس کراوە کە نەسرانییەکان بەم وێنەیە دڵیان پڕبوبوو لە توڕەیی و ڕق بەرامبەر موسڵمانان، بۆیە پاڵنەری نەفسیان لا دروست بوو کە پاڵی پێوە ئەنان بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانان، تا ئەگێڕنەوە کە ئافرەتێکی نەسرانی هیچ منداڵی نەبوو تەنها یەك منداڵ نەبێت، ئەم ئافرەتە هات و ماڵەکەی فرۆشت و بە پارەکە کوڕەکەی ئامادەکرد بۆ شەڕ لەگەڵ موسڵمانان لە پاڵ خاچپەرستەکان، لە شەڕەکەدا ئەم گەنجە بە بارمتەیی کەوتە بەردەستی موسڵمانان و ئەم چیرۆکەی گێڕاوەتەوە.

..........................................

**لە شەڕی(کۆریای باکوور) ئەمریکا نزیکەی(٣٥هەزار) سەربازی بووە قوربانی، وە لە شەڕی(ڤێتنام) نزیکەی(٥٠هەزار) سەربازی بووە قوربانی، لە چەندان شەڕی تر بە هەزاران سەربازی بووەتە قوربانی...بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەش دەرسی وەرنەگرت و هەڵسا بە هێرش کردنە سەر ئەفغانستان و عێراق و داگیرکردنیان.**

## تاوانکاریەکانی ئەمریکا لە عێراق:

**دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن حکومەتی بەعسی شۆڤێنی عێراقەوە لەساڵی(١٩٩٠) دواتر هێرشکردنە سەر وڵاتان و زۆربوونی ستەم و تاوانی ئەم حکومەتە، ئەمریکا بەم پاساوە هێرشە دڕندانەکانی دەستپێکرد لە مانگی ١٩مارس ساڵی(٢٠٠٣) کە ئەمریکا سەرۆکایەتی ئەم هاوپەیمانیەتە بوو کە بەریتانیا و چەند وڵاتێکی تر هاتنە پاڵ ئەم هاوپەیمانیەتیە کە بەهۆیەوە سەدان هەزار کەس کوژران و برینداربوون، وە سەدان کەس ئاوارە و دەربەدەی وڵاتان بوو، وە چەندین پێشێلکاری و تاوانکاری لەسەر دەستی سەربازانی ئەمریکا بەرامبەر هاوڵاتیانی بێتاوان و سڤیل ئەنجامدرا هەر لە کوشتن و بۆمباران کردن و گەمارۆی سەر عێراق کە بووە هۆی گیان لەدەستدانی هەزاران کەس، وە ئەمریکا بەمەوە نەوەستا و ژێرخانی ئەم وڵاتەشی ئیفلاس پێهێنا کە لێکۆڵینەوەکان دەری دەخەن ئەمریکا بە ئەنقەست چەندین پالأوگەی نەوت و قوتابخانە و یەکەی پزیشکی و پارك و شوێنە گشتیەکانی بۆردومان کردووە بۆ ئەوەی ژێرخانی ئەم وڵاتە ئیفلاس بێنێت و خێر و بێری ئەم وڵاتە هەموو بەهەدەر بچێت و موسڵمانان سوودی لێ نەبینن، ئەوەتا ئەبینین**

**لە( ١٧ ینایر-٢٨فبرایر) ساڵی ١٩٩١ هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق زیاتر لە(٨هەزار) و(٤٣٧)ماڵیان وێرانکرد، وە(١٥٧)پرد و سکەی ئاسنیان وێرانکرد، وە(١٣٠)یەکەی کارەبای سەرەکی و لاوەکیان تێکدا، وە(٢٤٩)باخچە و پارکی منالأنیان خاپوور کرد، وە(١٣٩)ماڵی چاودێری کۆمەلأیەتیان خاپوور کرد، وە(١٠٠)نەخۆشخانە و ناوەندی تەندروستی وێرانکرد، وە(١٧٠٨)قوتابخانەی سەرەتاییان خاپوور کرد.**

وە هەروەها چەندین پاڵاوگە و کێڵگەی نەوتی عێراقیان بۆردومان کرد، وەك:دووجار بۆردومان کردنی پاڵاوگەی(دورة) لە بەغداد و (نفط الشمال)لە بێجی ، وە سێزدە هێرش بۆ سەر (نفط الشمال)ی کرکوك، وە لە(بصرة)بەهۆی بۆردومانەوە(١,٤٤مليۆن)بەرمیلی نەون گڕی گرت وە(١٢,٦مليۆن)بەرمیل بەرهەمە نەوتیەکان گڕی گرت، وە(١,١٣مليۆن)مەتری چوارگۆشە لە گازی سروشتی بەهەمان شێوە گڕی گرت و بەهەدەر چوو، وە لە ئەنبار(٢٤٠هەزار)بەرمیل گڕی گرت، وە لە(تأميم)(٣٠مليۆن)مەتری چوارگۆشە لە گازی کیبریتی هایدرۆجین گڕی گرت، وە لە پاڵاوگەی بێجی(٢,٨مليۆن) لە بەرهەمە نەوتیەکانی گڕی گرت.

باشە با بپرسین ئەم شوێنە گشتیان بۆ بۆردومان کراون لە کاتێك هیچ بنکەیەکی سەربازی نییە!!!!!، هیچ شوێنێکی تایبەتی سەربازان نییە!!!! شوێنی دروستکردنی تەقەمەنی نییە؟؟؟!!

وەڵامەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە ئەمریکا هاتووە بۆ لەناوبردنی خێر و بێری وڵاتان و کاولکاری و خراپەکاری لە ژێر ناوی ئازادی و ڕزگارکردنی میللەتان.

**ئینجا با چەند خاڵێکی زۆر کەم لە تاوانەکانی ئەمریکا دژ بە عێراق باس بکەین:**

لە ساڵی ١٩٩١ فرۆکەکانی ئەمریکا هەڵسان بە بۆمبارانکردنی پەناگەی (عامرية) لە بەغداد کە بووە هۆی کوژرانی سەدان منداڵ و ئافرت و پیر، کە ئەمە یەکێکە لە تاوانە هەرە قێزەونەکانی ئەمریکا دەرحەق بە خەڵکی بێتاوان.

لە یونیو ساڵی( ١٩٩٣) بۆمبارانی موشەکی ئەمریکی و هێرشی ئاسمانی بۆ سەر عێراق ئەنجامدارا کە چەندین قوربانی لێکەوتەوە.

لە( ٣سبتمبر) سالی ١٩٩٦ هێزەکانی ئەمریکا هەڵسان بە بۆمبارانی موشەکی بۆ سەر بەغداد....کە لەم مۆمبارانەدا موشەکی جۆری(کروز)ئاراستەکراویان بەکارهێنا.

له ٢٨سبتمبر ساڵی ١٩٩٧ عێراق ڕایگەیاند کە زیاتر له(١,٢)ملیۆن کەس گیانیان لە دەستداوە بە هۆی کەمی مادده پزیشکیەکان لەماوەی سەپاندی گەمارۆ بەسەر عێراقدا.

کە گەمارۆی سەر عێراق بۆ ماوەی دەساڵ بەردەوام بوو پێش داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکاوە لە ساڵی(٢٠٠٣) کە زۆربەی منداڵانی شیرەخۆر تووشی کوێری و کەم(انسولین)بوونەوە.

وە ژمارەی کوژراوانی جەنگی عێڕاق بە پێی ڕێکخراوی(هلال الأحمر الأردني): (١١٣هەزار)کەسی مەدەنی کوژراون، کە سەدا ٦٠٪یان منداڵن.

وە(لیسلي ستال) دەڵێت:گوێمان لێبوو کە نیو ملیۆن منداڵی عێڕاقی مردوون بەهۆی سزا و گەمارۆ سەپێندراوەکان دژ بە عێڕاق، مەبەستم ئەوەیە ژمارەی کوژراوەکان زیاترە لە کوژراوانی منداڵانی هیرۆشیما، ئایا ئەم هەموو قوربانیانە شایستەی ئەمە بوون؟

ئەمە ئەو پرسیارەیە کە ئەم پێشکەشکارە کردی لە سەفیری ئەمریکا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەو کات و وەزیری دەرەوە لە سەردەمی(کلینتون) کە ئەویش (مادلین اولبرایت)ە، بەم شێوەیە وەڵامی داوە:(إننا نعتقد أن الثمن يستحق ذلك)[٦] واتە:(ئێمە پێمان وایە ئەم نرخ و قوربانیانە شایستەی ئەمەیە و ئەمە ئەهێنێ)

کوژرانی هەزاران موسڵمان شایستەیە و خوێنیان سووك و بێ بەهایە، بەڵام کوژرانی یەك کافر و بێدین تاوانێکە لێخۆشبوونی بۆ نییە!!!؟؟ئاههههه چ زەلیلی و بێ نرخیەك ڕووی لە موسڵمانان کردووە، کوا ئەو عیزەتەی سەردەمی هاوەڵان و تابعین و پیاوچاکان!!!!کوا ئەو غیرەت و جوامێریەی ئیمامی عومەر!!!!! شاعیر جوان وتوویەتی لە باسی ئەم وڵاتە خۆسەپێن و بێ بڕوایانە:

| | |
|---|---|
| قتل امرئ في غابة جريمة لا تغتفر | وقتل شعب كامل مسألة فيها نظر |

[٦] مقابلة في برنامج "٦٠دقيقة" التلفزيون ١٢ أيار مايو ١٩٩٦م

واتە: کوشتنی کەسێك لە دارستانێك تاوانێکە لێخۆشبوونی بۆ نییە...

بەلاَم کوشتنی نەتەوەیەك بە تەواوەتی بابەتێکە تێبینی و قسە هەڵئەگریٚ

وە پرسیار کرا لە (کولن باول)ئەو کاتی کە سەرۆك ئەرکانی سوپای ئەمریکا بوو دەربارەی ژمارەی کوژراوانی عێراقی، ووتی:(لست مهتما به اطلاقا)واتە:(ئەو بابەتە بەهیچ شێوەیەك لام گرنگ نییە)

لای(کولن باول)خوێنی دووسەد هەزار موسڵمان لەم شەڕەدا گرنگی نییە، ئەمە جگە لە کوژرانی سەدان هەزار کەس بەهۆی گەمارۆی سەر عێراق.

ئەمەیە ماف مرۆڤ لای ئەمریکا کە بانگەشەی بۆ ئەکەن!!!!!!!

وە کەناڵی جەزیرەی ئینگلیزی ڕایگەیاند کە چەند ڕاپۆرتێك هەیە ئاماژە بەوە ئەکەن کە سوپای ئەمریکا نزیکەی(٧٠٠)هاولاَتی مەدەنی کوشتووە کە ویستویانە نزیکبنەوە لە خاڵە پشکنینەکان، لە نێویاندا ئافرەتی حامیلە و نەخۆش و کەم عەقڵ بوونیان هەیە، وە چەندین پیاو کە خێزانەکانیان گواستۆتەوە بۆ نەخۆشخانە.

**بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و کۆمەڵکوژ:**

ئەمریکا و هاوپەیمانەکان ئەم یاسا و دەستورانەی کە دەریان کردووە تەنها چەند دروشمێکی ڕازاوەیە لە بابەتەکانی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادی و قەدەغەکردنی چەکی کۆمەڵکوژ و چەند بابەتێکی تر بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکانێکی ساویلکە و نەفام ، کە تەنها چەند دروشمێکە لەسەر غەیری خۆیان جێبەجێی دەکەن و بۆخۆیان ئازادن هەرچیەك بکەن و کەسیش ناتوانیٚ لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکات!!!!ئەمەش دڕندەیی و خۆسەپێنی ئەم ولاَتە دەردەخات.

وە یەکێك لەم پێشێلکاریانەی ئەمریکا بەرامبەر خەڵکی عێراق بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکرا و کۆمەڵکوژە، کە لە بۆردومانەکان چەکی ڕاداری حەراری گەرماوگەرمی بەکارهێنا کە کێشەکەی(١٥٠٠رطل)کە چەکێکی مەترسیدارە، وە

نزیکەی(٦٠بۆ٨٠هەزار) قومبەڵەی سوتێنەری فرێداوەتە سەر عێراق کە بەهۆیەوە(٢٨هەزار)عێراقی کوژران.

وە بە ئاشکرا چەکی یۆرانیۆمی بەکارهێنا لە جەنگی عێراق ، لە( ٢نوفمبر) ساڵی (٢٠٠٠)ڕاپۆرتێك دەری دەخات کە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەساڵی(١٩٩١)موشەك و تۆپی سوتێنەری یۆرانیۆمی تواوەیان بەکارهێناوە لە بۆردومانەکانیان بۆ سەر عێراق، کە بووەتە هۆی کوژران و شێوانی هەزاران کەس و گۆڕان و پیسبوونی سروشتی عێراق.
وە لە فەلوجە ئەمریکا بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە چەکی قەدەغەکراویان بەکارهێناوە، کە سەدان موسڵمان و ئیمانداری دەست پاك و دەم پاك شەهید بوون ڕوحی پاکیان بەخشی، وە تاوەکو ئێستاش ئەو کەسانەی بەهۆی ئەم چەکانەوەی بریندار بوونە ئەناڵێنن و گیرۆدەی چەندین نەخۆشی و دەرد بوونەتەوە وە منداڵەکانیشیان لەکاتی لەدایك بوون بە شێواوی دێنە دونیاوە.

وە لە( ١٧فبراير) ساڵی ١٩٩٣ ڕۆژنامەی(نیویورك تایمز)چەند شتێکی ئاشکرا کرد و پەڕی هەڵداوە لەسەر ئەوەی کە...فرۆکەکانی ئەمریکا گولە تۆپ و موشەکی وایان بەکارهێناوە دژ بە گەلی عێراق کە مادەی یۆرانیۆمی تیابووە!!! ...کە بەهۆیەوە زۆربەی منداڵانی عێراق گیانیان سپارد.
وە ئەم ڕۆژنامەیە ئەمەشی نوسیوە کە منداڵان زۆرترین کاریگەری ئەم تۆپ و موشەکانەیان لەسەر بووە، چونکە یۆرانیۆم بەشێوەیەکی خێرا کاریگەریەکانی لەسەر خانە و لاشە و ئێسکی منداڵ بە جێدەهێڵێت، وە دەبێتە هۆی مردن و لەبارچوونی کۆرپەی ناو سکی دایك.

## بەڵگە و دۆکیۆمێنتەکانی(وکیلیکس) و ئامارەکانی:

(وکیلیکس) چەند بەڵگە و دۆکیۆمێنتێکی نهێنی ترسناکی بڵاوکردەوە کە زۆر ئامارەی مەترسیداری تێدایە کە نزیکەی(٤٠٠هەزار)بەڵگەنامە و فایل دەبێت، بۆیە ئەمریکا لە مەڕ ئاشکراکردنی ئەم بەڵگەنامانە هاتە وەڵام و ئیدانەی کرد، وە

وتەبێژی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا ئەم بەڵگەنامانەی بە(مأساة)کارەسات ناوبرد کە یارمەتی دوژمنانی ڕۆژئاوا دەدات .

وە لەلای خۆیەوە(دافع جولیان اسانج) دامەزرێنەری ماڵپەڕی(وکیلیکس)کە ماڵپەڕێکە تایبەت بە دەرخستنی بەڵگە و دۆکیۆمێنتە نهێنیەکانی حکومەتەکان، وە بلاۆکردنەوەیان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت کە هەڵساوە بە دەرخستنی سەدان و هەزاران بەڵگە و دۆکیۆمێنتاری نهێنی لەسەر شەڕی عێراق و داگیرکردنی، وە ڕاشیگەیاند کە ئامانج لە بلاۆکردنەوەی وردەکاری ئەم زانیاریانەی شەڕ دەرخستنی ڕووی ڕاستەقینەی شتەکان بۆ هەموو جیهان.

وە ئەم بەڵگەنامانە ئاماژە بەوە ئەکەن کە سەرکردایەتی سەربازی ئەمریکا لە عێراق ئاگادار بووە لەو هەموو ماف شکاندن و پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤ و کردەی سزادان لە زیندانەکانی عێراق کە زیندانیان ڕووبەڕوی چەندین سزای توندی بە ئێش بوونەتەوە بەلاّم ئەمریکا گوێی پێنەداوە و شکستی هێناوە لەوەی لێکۆڵینەوە بکات لەم دۆسیەیە.

وە هەروەها ئاماژە بەوە ئەکات کە سەدان کەسی مەدەنی عێراقی کوژراون لە خاڵەکانی پشکنین کە هێزەکانی ئەمریکا جێگیریان کردبوو دوای داگیرکردنی کردنی عێراق لە ساڵی(٢٠٠٣).

وەهەروەها بەرپرسانی ئەمریکا ڕەخنەیەکی زۆریان گرت لە بلاۆکردنەوە و بردنی ئەم زانیاری و دۆکیۆمێنتانە و دەڵێن:سەربازانی ئەمریکی و زیاتر لە(٣٠٠) یاریدەدەری عێراقی گیانیان دەکەوێتە مەترسی و ڕوبەڕوی مەترسی دەبنەوە... ، وە هەروەها وەزیری دەرەوە ئەمریکا(هیلاری کلینتون)ئیدانەری ئاشکراکردنی دۆکیۆمێنت و بەڵگەکانی کرد و ڕایگەیاند کە ئەم کارانەی(ویکلیکس)ژیانی خەڵکانێکی زۆر دەخاتە مەترسیەوە.

وە وەزیری بەرگری ئەمریکا(بنتاغون)ڕەخنەی گرت لە بلاۆکردنەوەی ئەم دۆکیۆمێنتارە نهێنیانە، کە بە گەورەترین درز و کەلێنی ئەمنی دادەنرێت لە مێژووی

سەربازی ئەمریکا،کە زۆر بەرزترە لە بلاۆکراوەکەی تری ئەم ماڵپەڕە کە هەڵسابوو بە بلاۆکردنەوەی (٧٠)هەزار مەلەفی شەڕی ئەفغانی.

وە بەڵگە و دۆکیۆمینتەکان ئاماژە بەوەش ئەکەن کە زیاتر لە(١٠٩)هەزار کەس کەسی عێراقی کوژراوە لە ماوەی نێوان ٢٠٠٤-٢٠٠٩، کە لە نێویاندا (٦٦,٠٨١) کەسی مەدەنی، وە (٢٣,٩٨٤)ئەو کەسانەی وەسف کراوان لای ئەمریکا بە دوژمن، وە (١٥,١٩٦)لە هێزەکانی عێراق، وە(٣,٧٧١)لە هێزەکانی هاوپەیمانان.

## کوشتنی کەسی مەدەنی:

ویکیلیکس لە بەیاننامەکەی ئاماژە بەوەش ئەکات کە: چەندین ڕاپۆرت هەیە لەسەر کوشتنی خەڵکی مەدەنی بەشێوەی هەڕەمەکی لە خاڵەکانی پشکنین و زیندانەکان کە زۆر بە دڕندانەیی ئەشکەنجە دراون، وە هێندێك کات سەربازانی ئەمریکا باڵەخانەی شارێکیان خاپوور کردووە بەهۆی بوونی یەك کەسی گومانلێکراو کە لە سەربانێکەوە بینراوە.

وە بەهەمان شێوە بەڵگەکان دەری دەخەن لە مانگی یولیو ساڵی(٢٠٠٧) سەربازانی ئەمریکا (٢٦)کەسیان کوشت کە نیوەیان زیاتر مەدەنی بوون کە فرۆکەیەك بە ئاراستەی خەڵك دەستڕێژی گوللەی کرد، وە بەیاننامەکان جەخت دەکەنەوە لەسەر کوشتنی خەڵکانی ئاسایی لە خاڵەکانی پشکنینی هێزی ئەمریکا و ئەنجامدانی چالاکیەکان.

بۆیە(اسانج)دەڵێت: بەڵگە و دۆکیۆمێنتەکان چەندین بەڵگەی دەرخست لەسەر ئەنجامدانی تاوانی جەنگ لە عێڕاق، بەلاّم (بینتاغون) بەرهەڵستی ئەمە دەکات.

## گرنگترین خاڵەکان کە لە دۆکیۆمێنتاریەکان هاتووە:

زیاتر لە(١٠٩)هەزار کەس کوژراون لە عێراق، کە لە نێویاندا(٦٦,٨١)کەسی مەدەنی(لەگەڵ بوونی(١٥)هەزار کەس کە حاڵیان نەزانراوە تاوەکو ئەم کاتە)، وە

(٢٣,٩٨٤)ئەو کەسانەی وەسف کراون بە دوژمن، وە (١٥,١٩٦)لە هێزەکانی عێراق، وە(٣,٧٧١)لە هێزەکانی هاوپەیمانان.

لە دۆکیۆمێنتارەکە دا کەسێکی زیندانیکراو جەخت ئەکاتەوە کە تووشی چەندان ئەشکەنجە و لێدان بۆتەوە بۆ ماوەی دووشەو لە دوای یەك، وە بە کێبڵ و قامچی لێی دراوە بە دەستی پۆلیسی عێراقی ، وە یەکێکی تریش ئەڵێت:تووشی لێدان بووتەوە لە ژێر پێی و بەکارهێنانی کارەبا.

وە ماڵپەری (ویکیلیکس) ئاماژە بەوە ئەکات کە زیاتر لە ٣٠٠حاڵەتی چەسپاو لەبەر دەستە کە هێزەکانی هاوپەیمانان چەندین جۆر ئەشکەنجەیان بەکارهێناوە لە زیندانەکان، نەوەك تەنها لە زیندانی (ابو غريب) بەڵکو لە هەموو شوێنێك.

وە هێزەکانی ئەمریکا ٦٠٠-٧٠٠کەسی مەدەنیان کوشتووە لە خاڵە پشکنینەکان یان بە هەڵە دەستڕیژی کردنی گوللە.

## تاوانکاریەکانی ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان:

دوای کشانەی هێزەکانی یەکێتی سۆڤییەت لە ساڵی(١٩٨٩)دوای ئەو شکستە گەورەی بەسەریان هات بەرامبەر موسڵمانان، ئەمریکای خوێن ڕێژ لە ژێر ناوی تیرۆر و بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر و کۆتایی هێنان بەو کیان و دەسەلآتە ئیسلامییەی کە دروست بوبوو لە ناوچەکە هێرشێکی دڕندانەی کردە سەر ئەفغانستان کە هەزارن موسڵمان شەهید کران و ملیۆنان کەس ئاوارە و دەربەدەر بوون و کاولکاریەکی سامناکی بەسەر شار و دێهاتەکانی ئەم شارە هێنا کە مێژوو لەیادی ناچێت و تۆماری ئەکات .

وەهەروەها بەهۆی گەمارۆی سەر ئەفغانستان نزیکەی(١٥هەزار)منداڵی ئەفغانی کوژران، ئایا ئەم مندالآنە چ تاوانێکیان هەبوو(بأيِّ ذنْبٍ قُتلِت)!!!!؟؟؟؟؟؟

وە تەنها لە ماوەی سیٚ مانگ لە ساڵی(٢٠٠١)بەهۆی بۆردومانەکانی ئەمریکاوە زیاتر لە(٥٠هەزا)ئەفغانی کوژران، کە زۆرینەیان خەڵکی مەدەنی بوون ئەگەر هەمووشیان مەدەنی نەبووبن.

**بەهانە بە هێرشەکانی(نیویورك)و(واشنتن):**

ئەمریکا بە بەهانەی هێرشەکانی قاعیدە بۆ سەر(نیویورك)و(واشنتن) لە ئەمریکا هێرشی کردە سەر ئەفغانستان بۆ دەستبەسەر کردن یان کوشتنی شێخ(اسامە بن لادن) و(ملا عمر)سەرکردەی تاڵیبان، کە دواتر مەبەستی گلاَوی ئەمریکا ئاشکرا بوو کە تەنها مەبەستی لەناوبردن و نەهێشتنی ئەو کیان و دەسەلاَتە ئیسلامیەیە کە لەناوچەکە دروست بووە چونکە گەر سەیری مێژوو بکەین بەریتانییەکان هاتوون و هێرشیان کردۆتە  سەر ئەفغانستان دواتر ڕوسیا هێرشی کردە سەر ئەفغان لە کاتیك (ئوسامە بن لادن) هەر بووونیشی نەبوو،  وە دواتریش ئەمریکا هێرشی کرد– خوای پەروەردگار هەموویان لەناو بات وەك هاوپەیمانەکانی پێشتری لەناوبرد–

(البی بی سی)ڕاپۆرتێکی گواستۆتەوە لە یەکێك لە دیبلۆماسەکانی پاکستان کە دەڵێت:ویلایەتە یەکگرتووەکان پیلانی سەربازییان دارشتبوو دژ بە ئوسامە بن لادن و کۆمەڵەی تاڵیبان پێش ئەوەی هێرشەکانی(نیویورك)و(واشنتن)ڕوویدات.

کەوابوو تاکە مەبەستی ئەمریکا ڕێگرییە لە دروست بوونی دەوڵەتێکی ئیسلامی کە موسڵمان خۆیان کاروبارەکانی خۆیان بەڕێوە ببەن و بە ئازادی بژین، ئەم بەهانانەش تەنها بۆ پەردەپۆشکردنی ئەو هەموو تاوان و خراپانەیە کە ئەنجامیان داوە بەرامبەر موسڵمانانی بێتاوان.

**بەکارهێنانی چەکی کیمیای و نەوەوی دژ بە گەلی ئەفغان:**

لەو هێرشانەی ئەمریکا بۆ سەر  ئەفغانستان چەندین جۆر چەکی کیمیایی لەناوبەری توێنەرەوە بەکارهاتووە کە جۆرەکەی زۆر مەترسیدارترە لەو چەکە کیمیاویانەی کە لە عێراق بەکارهات.

دکتۆر( اصف دراکوفیتش) مودیری مەرکەزی پزیشکی بۆ لێکۆڵینەوەی یۆرانیۆم لە واشنتۆن لەسەر ئەفغانستان هەڵسا بە لێکۆڵینەوە لە ناوچە جیاوازەکان لە باکور و باشوور و ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوای ئەم ولاّتە، وە سیٚ جار یەکەیەکی پزیشکی نارد بۆ ئەفغانستان بۆ ئەوەی ڕاستیە پزیشکیەکان دەرکەویٚت لەم بابەتە:

جێگیر بووە لە لێکۆڵینەوە پزیشکیەکان کە بڕی ماددەی یۆرانیۆم لە لاشەی ئەفغانییە بریندارەکان (دوو هەزار بۆ چوار هەزار و شەست هێندە) زیاترە لە بڕی یۆرانیۆم لە لاشەی عێراقییەکان، کە ئەمەش ئاماژە بە بەکارهێنانی ئەم چەکە دەکات بەشێوەیەکی زۆر بەربلاّو لەم ولاّتە.

لە بەرنامەیەکی ڕاستەوخۆ کە ڕۆژنامەی (لایف) ی ئەمریکی بلاّوی کردەوە لە یەکێك لە ژمارەکانی لە ساڵی(١٩٩٦)کە ئەم بەرنامەیە قسە و دەمەتەقێیەکی زۆری لەسەر دروست بوو کە(دراکوفیتش) ووتی:بەهۆی بۆردومانەکانەوە بریندارەکان تووشی گۆڕانی بۆماوەیی منداڵ بوونەتەوە کە زۆربەیان منداڵی شێواویان بووە.

وەهەروەها(دراکوفیتش) ڕایگەیاند کە ئەو قومبەڵە یۆرانیۆمانەی بەکارهاتووە بەرامبەر عێراق زیاتر نەبووە لە پێنج کیلۆ گرام، بەلاّم ڕێژەی ئەو قومبەلاّنەی بەکارهاتووە دژ بە ئەفغانستان دەگاتە هەزار تەن، وە دەڵێت:ئینجا بیر بکەوە ئەبێت چ کاولکاری و وێرانیەکی بەدوای خۆ هێنا بێت جگە لە مرۆڤ بۆ سروشت و خاك و ژێرخانی ئەم ولاّتە لە سالاّنی رابردوو.

وە ڕایگەیاند: ئەگەر ئەوەی بەسەر عێراق هات لە ماددەی و قومبەڵەی نەوەوی حەوت هێندەی ئەو بۆردومانانە بێت کە بەسەر (هیرۆشیما و ناکازاکی) داهات، ئەفغانستان بە ڕیژەی کەم دە هەزار هێندەی بەسەرهاتووە کە بەسەر ئەم دوو شارەی یابان داهات، بۆیە ئەمریکا هەموو لێکۆڵینەوەیکی زانستی ڕەت دەکاتەوە بۆ دەرخستنی ئەم ڕاستیە و دژایەتی ئەکات بە هەموو شێوەیەك.

بۆیە ئەبینین ئەگەر یەك تەقینەوەی سادە ڕووبدات لە ولاّتانی ئەورووپا و ئەمریکا کۆبوونەوەی تایبەتی بە پەلە ڕێك ئەخرێت و بەکارێکی دڕندانە و تیرۆریستیانە

ناوزەندی دەکەن، بەڵام بۆخۆیان هیچ کێشە نییە بە هەزاران تەن ماددەی کیمیایی بە ڕۆژی ڕوناك فرێدەنە خوارەوە بۆسەر موسڵمانان و ماڵ و موڵکی خەڵك!!!!؟؟

## کوشتنی بارمتە و گیراوی شەڕ:

ئەمریکا بە یارمەتی حوکومەتە بەکرێگیراوەکانی وەك پاکستان سەدان گەنج و لاوی خوێن گەرمی خستە زیندانەکان و بەتوند ترین شێوە ئەشکەنجەیان ئەدان کە یاسا کوفریەکانی خۆیان بە تاوانی جەنگ ناوی دەبەن لە ئەشکەنجی قورس و هەڵواسین و لێدان و بەکارهێنانی کارەبا، وە هەروەها لە زۆربەی کاتەکانیش سوکایەتی بە دروشمە ئیسلامیەکان کراوە لە سوتاندنی ڕیش و قورئان و چەندان کاری قێزەونی تر، وە هەموو ئەمانە بۆ سوکایەتی کردن بووە بە ئوممەتی ئیسلامی و ملیارێك موسڵمانی سەر ڕووی زەوی.

بۆیە ئەمریکا نەدینی هەیە نە ڕەوشت هەموو ئامانجێکی خۆسەپاندن و لەناوبردنی بەرامبەرەکەیەتی بۆیە دەستی گڵاوی پیس بووە بە یەکێکی تر لە تاوانکاریەکانی بەرامبەر خەڵکی ئەفغان کە کوشتنی گیراوەکانە ، بە هەزاران کەسی بارمتە و گیراو لە کونجی زیندان و شوێنە تەسکەکان ڕوحی پاکیان تەسلیم کردووە لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا شەهید بوونە.

تەلەفزیۆنی(الدیمقراطیة الیوم)ی ئەمریکی تاوانێك لە تاوانەکانی ئەمریکای ئاشکرا کرد لە ڕێگەی پێشکەشکردنی فیلمێکی دیکیۆمێنتاری بەناونیشانی(المذبحة الأفغانية:قافلة الموت)کە تاوانی کوشتنی (٣هەزار) بارمتە و گیراوی ئەفغانی لەسەر دەستی هێزەکانی ئەمریکا دەردەخات، کە ئەم فیلمە قسەیەکی زۆری ناوە لەناو ناوەندە ڕەسمیەکان.

وە گۆڤاری(النیوزویك)[٧]: جۆرێك لە تاوانكاری شەڕی ئەفغانی ئاشكرا كرد كە(٣٠٠٠)هەزار گیراوی تاڵیبان لە ژێر زەمین و ژوورە تەسكەكان كۆكراونەتەوە و بە برسیەتی و نەخۆشی، وە لە یەك قاوش نزیكەی(٨٠٠)كەسیان خستۆتە ناوی، وە سەدانیان لە كاتی گواستنەوەیان بۆ زیندان لەناو قەفەزە پلاستیكیەكان خنكاون!!!

وە ئەوەی كە ڕوودەدات لە ئەفغانستان لە كوشتنی بێتاوانان و چەوساندنەوەی موسڵمانان و كوشتنی بارمتە و گیراوەكان پەڵەیەكی ڕەش و شەرمەزاریە بە نێوچاوانی هەموو وڵاتان و كۆمەڵگاكان و شارستانیەكان كە ئەم شێوازە ڕەفتارەی بەرهەم هێناوە كە هەمان ڕەفتاری چاخی ناوەڕاستە لە مێژووی ئەوروپا.

وە لە هەمووی سەیرتر یەكێك لە ئەندامانی ئیدارەی ئەمریكا كە ئەویش وەزیری بەرگرییە(دونالد رامسفیلد)بەرامبەر ڕاگەیاندنەكان بەبێ شەرمانە ڕێنمایی دا بە سەربازەكانی و ووتی:(ئێمە بارمتەمان ناوێت بەڵكو كوشتن و لەناوبردن)، وە بەخۆزلیەوە وتی:(كوشتنی كەسی سڤیل هەر ئەبێت ڕووبدات لە پێناو شەڕی تیرۆر) وە ئەم زیندانیە دڕندانەی ئەمریكاشی بۆ زۆر بینی بۆ موسڵمانان بەرامبەر هەموو جیهان ووتی:(ئەمانە شایەنی بارمتەیی و زیندان نین بەڵكو شایەنی كوشتنن).

**(هیومان ڕایتس)[٨] تاوانكاریەكانی ئەمریكا لە ئەفغانستان ئاشكرت ئەكات:**

لە ساڵانی كۆتایی هێرشەكانی ئەمریكا بۆ سەر ئەفغانستان زیاتر بوو، وە خەڵكانێكی زۆریش بەهۆی بۆردومانەكانەوە بوونە قوربانی كە خەڵكی مەدەنییان كردبووە ئامانج، لە ساڵی ٢٠٠٦-٢٠٠٧ هێرشە دڕندانەكانی ئەمریكا لە ئەفغانستان چەندین قوربانی لێكەوتەوە لە خەڵكی مەدەنی، تەنها لە ساڵی ٢٠٠٧ (٣٢١)كەسی مەدەنی و سڤیل كوژراون بەهۆی بۆردومانەكانی ئەمریكا بۆسەر گوندەكان، وە لە ساڵی(٢٠٠٦) (١١٦)كەس كوژران، وە لە نیوەی

[٧] (٢٠٠٢/٨/٢٧م)
[٨] (٢٠٠٨سبتمبر)

ساڵی(٢٠٠٨)(١١٩)کەسی مەدەنی کوژران، کە ئەمانەی هەموو بەهۆی بۆردومانی ئاسمانیەوە کوژراون.

وە فڕێدانە خوارەوەی قومبەڵە و موشەکەکان ساڵ دوای ساڵ زیاتر دەبوو لەسەر ئەفغانستان تەنها لە مانگی( یونیو و یولیو)ی ساڵی(٢٠٠٨) فرۆکەکانی ئەمریکا ئەو قومبەڵە و موشەکانەی خستیانە خوارەوە بۆ سەر گوند و شارەکانی ئەفغان بە بڕی ئەو بۆردومانانە دێت کە لە هەموو ساڵی(٢٠٠٦)ئەنجامدرابوو.

**کارەساتەکەی(عزیز آباد) ژمارە خەڵەتێنەرەکانی ئەمریکا پوچەڵ دەکاتەوە:**

هێرشێکی ئاسمانی ئەمریکی لە(٢٢اغسطس) ساڵی ٢٠٠٧ کرایە سەر شارەدێی (عزیز اباد) لە ویلایەتی(هیرات) کە لێپرسراوانی (کابول) جەختیان کردەوە کە بەهۆی ئەم هێرشەوە(٩٠)کەس کوژراون کە زۆرینەیان منداڵ و ئافرەتن، ئەمە لە کاتێك هێزەکانی هاوپەیمانان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە(٢ سبتمبر) ڕایانگەیاند کە(٥بۆ٧ کەس)ی مەدەنی کوژراون، وە(٣٥)ئەندامی (تاڵیبان)یش کوژراون، کە ئەمەش یەکێکە لە چەواشەکاریەکان لەلایەن ئەمریکاوە کە چەندین بەڵگە و ڕاستی ئەمە ئەسەلمێنن و حوکمەتی کابول و ویلایەتە یەکگرتووەکانیش جەختیان کردەوە لەسەر ئەمە.

بۆیە ئەگەر سەیری مێژوو و ڕەوڕەوی ئەمریکا و هاوپەیمانانی بکەین ئەبینین دسەلاٌت و سەروەری و شارستانیەتیان لەسەر درۆ و خیانەت و ناڕاستی بنیات ناوە و چەندان ڕێگایان گرتۆتە بەر بۆ بەدەستهێنانی هیواو وئامانجەکانیان ئینجا ڕێگایەی دروست بێت یان ڕێگایەی نادروست و نەشیاو گرنگ ئەوەیە بگەن بە ئامانجە بۆگەنەکانی خۆیا، ئەوەتا ئەبینین لەبواری ڕاگەیاندن چەندین کەناڵی ناوخۆی و دەرەکی و ویب سایت و هەموو بوارەکانیان وەگەڕخستووە بۆ چەواشەکاری خەڵك و شێواندنی ڕاستیەکان، ئەمەش سەیر نییە، بەڵێ چونکە پێغەمبەر(ﷺ)هەواڵی ئەم ڕۆژەی پێداوین و ئاگاداری کردووینەتەوە و دەفەرمووێ:

(سيأتي على الناس سنوات خداعات يصدق فيها الكاذب، ويكذب فيهاالصادق، ويخون فيها الأمين، ويؤتمن فيها الخائن)

واته:(ساڵانێكی هەڵخەڵەتێنەرە دێت بەسەر خەڵك كە درۆزن بە ڕاستگۆ دادەنرێت و ڕاستگۆ بە درۆزن دادەنرێت، وە ناپاك بە دەستپاك و ئەمین دادەنرێت، وە دەستپاك بە ناپاك لە قەڵەم دەدرێ).

وە ئەمەش سیاسەتی جولەكەی نەفرەتی و دروشمە بەناوبانگەكەی(جوزیف جوبلز)ە–سەرخەر و وەزیری ڕاگەیاندنی نازیەكان و هاوڕێی هیتلەر– كە ئەڵێن:(اكذب، ثم اكذب حتي يصدقك الناس)واته:(درۆ بكە دووبارە درۆ بكە تاوەكو بە ڕاستگۆ دادەنرێی)یان دەڵێ:(اكذب اكذب حتى يصدقك الآخرين ثم اكذب حتى تصدق نفسك)واته:(درۆ بكە، درۆ بكە تاوەكو خەڵك بڕوات پێدەكەن، دواتر درۆ بكە تاوەكو خۆت بڕوا بەخۆت دەكەیت).

بۆیە ئەبینین بە ڕۆژ و شەو بیر و هزری خەڵكیان پڕ كردووە لە درۆ و ناڕاستی و بەداخەوە خەڵكانێكی ساویلكەی موسڵمان پێیان هەڵخەڵەتاون لە كاتێك قوڕئان ئاگادارمان ئەكاتەوە ئەفەرمووێ:(يأيها الذين امَنوا إن جاءَكُم فاسِق بِنَبإ فَتَبَيَّنوا أن تُصيِبُوا قوماً بِجَهلةٍ فتُصْبِحُوا عَلى مَا فَعلتُم نَدِمِين)

واته:(ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! ئەگەر كەسێكی متمانە پێنەكراو(فاسق) هەواڵێكی بۆ هێنان خێرا بڕوای پێ مەكەن بەڵكو لێی بكۆڵنەوە(تا ڕوون دەبێتەوە) نەوەك زیان بگەیەنن بە خەڵكێك بە نەزانین ئەوسا پەشیمان بن لەو كارەی كردووتانە)

لە خوێندنەوەیەكی تر لە بڕی(فتبيَّنوا) ووشەی(فتثبَّتوا)هاتووە واته:هەواڵەكە جێگیر بكەن،

كەوابوو خودا داوا لە ئیمانداران ئەكات ڕاستەوخۆی بڕوا نەكەن بە كەسێكی فاسیق گەر چی موسڵمانیش بێت، ئینجا چۆن دروستە موسڵمان بڕوا بە كەسێكی كافر و بێبڕوا بكات كە دژایەتی خوا و پێغەمبەر ئەكات و شەڕی ڕاگەیاندووە بەرامبەر

موسڵمانان، بۆیە با هەمووومان بە هۆش خۆمان بێینەوەو بڕوا بە کەناڵە درۆزنەکانی عەلمانی و بێبڕواکان نەکەین!!!.

## دڕندەیی و تاوانکاریەکانی ئەمریکا لە سەدەی بیست و ڕەوڕەوەی مێژوو:

١- لە مانگی(ابریل) ساڵی ١٩١٦: هێزی دەریایی ئەمریکا هەڵسان بە سەرکوتکردنی شۆڕشێك لە (دۆمینکان)، پاشان داگیرکردنی ئەم وڵاتە بە تەواوی لە سەرەتای مانگی(مایو)، وە ئەم داگیرکردنە بەردەوام بوو بۆ ماوەی هەشت ساڵ.

٢- لە مانگی(مایو)ساڵی١٩٤٥: فڕۆکەکانی ئەمریکا شاری(درسدن)ی ئەڵمانیان بۆردومان کرد، کە بەهۆی ئەم بۆردومانانەوە (١٥٠هەزار) کەسی سڤیل کوژران، وە هەروەها سەددا٦٠٪ بیناکانی ئەم شارە خاپورکرا.

٣-لە مانگی(٦اغسطس) ساڵی(١٩٤٥): سەرۆکی ئەمریکا(ترومان)فەرمانی دا بە خستنە خواری قومبەڵەی زەڕری بۆ سەر شاری (هیرۆشیما) ی یابانی کە بووە هۆی کوژرانی (٧٨هەزار) و(١٥٠)کەس، لەگەڵ بریندداربوون و گۆڕن(مشوە)بوونی سەدان کەس.

٤- لە(٩اغسطس) ساڵی١٩٤٥: (ترومان)سەرۆکی ئەمریکا دووبارە فەرمانی دا بە بۆردومانکردن بە قومبەڵەی زەڕری دووەم بۆ سەر شاری(ناکازاکی)یابانی، کە بووە هۆی کوژرانی (٧٣هەزار) و(٨٨٤) کەس، وە بریندداربوونی(٦٠هەزار) کەس، لەگەڵ لەناوچوونی تەواوی گیانلەبەر و بەروبوومەکانی ئەم شارە.

٥- لە(١٩٤٦): ئەمریکا دەستی بەسەر(٢٥٠هەزار)تەن غازی(تابون) گرت لە ناوچەی (جیورجیان) لە نەمسا کە غازێکی لەناوبەر و وێرانکارە لەبڕی لەناوبردن و نەهێشتنی بە نهێنی گواستیەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان.

٦- له ساڵی(١٩٤٩): ویلایەته یەکگرتووەکان شەڕێکی ناوخۆییان هەڵگیرساند له یۆنان، کەبه هۆیەوه (١٥٤هەزار) کەس بوونه قوربانی، وه نزیکەی (٤٠هەزار) کەس کەوتنه کونجی زیندانەکان، وه( ٦هەزار) کەس له سێدارەدران.

وه (ماکویغ) سەفیری پێشووی باڵیۆزخانەی ئەمریکا له یۆنان دانی نا بەوەی که هەموو ئەو کاره تەکنیکی و تەمیٚ کردنانەی که حوکمەتی سەربازی یۆنان پێی هەڵسا لەماوەی نێوان ساڵی١٩٤٧ و ١٩٤٩بەو شێوه جێبەجیٚ کرا که (واشتنتۆن) دای ڕشتبوو.

٧- له (٣مارس)ساڵی(١٩٤٩): دەزگای هەواڵگری ناوخۆیی ئەمریکا کودەتایەکی سەربازی جێبەجێکرد له سوریا به ڕێبەرایەتی(حسنی الزعیم)... که پیلانی ئەم کودەتایه له باڵوێزخانەی ئەمریکا له دیمەش دارڕشترابوو.

٨- له(١٤غسطس) ساڵی ١٩٤٩: کۆمەڵێك له ئەفسەره سورییەکان به ڕێنیشاندەرایەتی باڵوێزی ئەمریکا له دیمەشق گەمارۆی ماڵی(حسنی زعیم)یان دا و کوشتیان، ئەمەش دوای ئەوەی ملکەچ و ژێرباری ئەمریکا نەبوو.

٩- له(٢٦یونیو) ١٩٥٠ ویلایەته یەکگرتووەکان به شێوەیەکی سەربازی چووه پاڵ کۆریای باشوور دژ به کۆریای باکور.

١٠- شەڕی کۆریا:

یەکه وشکانیەکان و فرۆکه سەربازییەکانی ئەمریکا له (٢٦) تا(٢٩)(یولیو) ساڵی (١٩٥٠) نزیکەی ٣٠٠ بۆ٤٠٠ کەسی سڤیلیان کوشت له کۆریای باشوور له گوندی(نوجن-ری) که زۆربەی کوژراوەکان ئافرەت و منداڵ و پیربوون.

١١- له (١٠مارس) ١٩٥٢ : ویلایەته یەکگرتووه یارمەتی و پشتیوانی جەنەراڵ (باتیسان)یان دا بۆ کودەتا کردنی سەربازی دژ به دەسەڵاتی کۆماری له کوبا....وه پاش گرتنه دەستی دەسەڵات کەوتنه جێبەجێکردنی حوکمی دیکتاتۆری ودواکەوتووی و پەیوەست بوون به ویلایەته یەکگرتووەکان.

١٢- لە(١٩غسطس) ساڵی١٩٥٣: دەزگای هەواڵگری ناوخۆیی کودەتایەکی سەربازی کرد دژ بە حکومەتی(مصدق)ی نیشتیمانی لە ئێران...کە پیلاندارێژەری ئەم کارە و جێبەجێکردنی لەلایەن (کیم روزفلت)ئەنجامدار کە نەوەی(تیودور روزفلت)ی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانە.

١٣- لە(٢٧یونیو) ساڵی١٩٥٤ : دەزگای هەواڵگری ناوخۆیی ئەمریکا هەستا بە جێبەجێکردنی کودەتای سەربازی لە(غواتیمالا)دوای ئەوەی فرۆکەکانی ئەمریکا پایتەختەتی ئەم ولآتەیان بۆمباران کرد و لەهەندێك ناوچە فڕۆکەی(ب.٢٦)بەکارهێنرا

وە سوپای ئەمریکی مەشقکراو لە(غواتیمالا) زیاتر لە(١٥٠هەزار)جوتیاری کوشت.

١٤- لە (٢٥یولیو) ساڵی١٩٥٨: لوبنان داگیرکرا بە شێوەی سەربازی لەلایەن ئوستوڵی شەشی ئەمریکی بۆ پشتیوانی لە حکومەتی(کمیل شمعون)، دوای جێبەجێکردنی کودەتا لە عێڕاق لەم کاتەدا.

١٥- لە(١٦ابریل)ساڵی ١٩٦١: ویلایەتە یەکگرتووەکان هەوڵی داگیرکردنی (کوبا)ی دا لە ڕێگای چەند کۆچبەرێکی کوبی، بە پشتیوانی فرۆکە سەربازیەکانی ئەمریکا و یارمەتی ڕاستەوخۆ، ئەم کارەش ناوی لێنرا بە(معرکە خلیج الخنازیر)کە ئەمریکا شکستێکی گەورەی بەسەرهات لەم شەڕە.

١٦- لە (١نوڤمبر) ساڵی١٩٦٣: دەزگای هەواڵگری ئەمریکا هەڵسا بە کوشتنی(نیجو دین دیم)سەرۆك کۆماری ڤێتنامی باشوور کە پێشتر بەکرێگیراوی خۆی بوو.

١٧- لە ساڵی١٩٦٤: ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڵسا بە کرداری دوژمنانەی چەکداری دژ بە(لاوس)بە مەبەستی پشتیوانی ئەو حکومەتی کە لە خۆی نزیکە .... لەم شەڕ و دوژمنکارییە(٥٠هەزار) سەرباز و جەنەڕاڵی ئەمریکی، وە هەزار و(٥٠٠)فرۆکە و (٤٠)کەشتیگەلی شەڕ بەشداربوون، وە هەروەها ئەمریکا لەم شەڕەدا چەکی کیمیایی بە شێوەیەکی گەورە و فراوان بەکارهێنا.

١٨- لە(٣٠یولیو) ساڵی١٩٦٤: دەزگای هەواڵگری ئەمریکا هەڵسا بە ئەنجامدانی چالاكیەك لە خەلیجی(تونكین)ی ڤیێتنام لە ناو پیلانی(٣٤أ)كە دایان ڕشتبوو بە مەبەستی بەدەستهێنانی بەڵگە و پاساوێك بۆ دەست وەردان و هێرش كردنە سەر ڤێتنام....بە شێوەی پیلانەكە ویلایەتە یەكگرتووەكان ٦٤هێرش ئاسمانیان كردە سەر(٤) قاعیدەی دەریایی.

١٩- لە (٢٨ابریل) ساڵی١٩٦٥: ویلایەتە یەكگرتووەكان بە شێوەی سەربازی چووە ناو (دومینكان) لە دوای ئەم داگیركردنە خەباتی شۆڕشگێڕی لەم ولاَتە سەری هەڵدا.

٢٠- لە(٤مایو)ساڵی١٩٦٥:(جونسون)فەرمانی دا بەناردنی (١٤هەزار) سەربازی ئەمریكی بۆ داگیركردنی(سان دو منجو)بۆ ماوەیەكی نادیار.

٢١-لە(٢٤دیسمبر) ساڵی١٩٦٦: هێزی ئەمریكا (١٢٥)كەسی مەدەنی لە ڤێتنام كوشت، لەگەڵ ئەوەی ڕایگەیاندبوو كە شەڕ ڕائەگرێ بۆ ماوەی(٤٨كاتژمێر) بەبۆنەی جەژنی سەری ساڵ.

٢٢- لە ساڵی١٩٦٨:دەزگای هەواڵگری ناوخۆی ئەمریكا هەڵسا بە بەڕێوەبردنی كودەتایەكی سەربازی كە لەلایەن(سوهارتو)پێشەوایەتی دەكرا دژ بە (سوكارنو)سەرۆكی ئەندۆنیسیا، كە ئەم ولاَتەی بەرەوە ئازادبوون لە یابانیەكان برد دواتر ئازاد بوون لە هۆڵەندییەكان، كە دوای ئەم كودەتایە شانۆی لە سێدارەكان پڕبوون و نزیكەی ملیۆنێك كەس بوونە قوربانی ئەم كودەتایە.

٢٣-لە(٤ابریل)ساڵی١٩٦٨: دەزگای هەواڵگری ئەمریكا هەڵسا بە تیرۆركردنی(مارتن لوثر كنج)كە داواكار و پشتیوانی ماڤ ستەم لێكراوان بوو.

٢٤- لە(٢٠ابریل)ساڵی١٩٧٠(٣٢)هەزار سەربازی هێزی ئەمریكا بە پشتیوانی(٥٠٠)فڕۆكەی ئەمریكی و (٤٠)كەشتیگەلی جەنگی سەر بە ئوستوڵی حەوتی ئەمریكی هەڵسان بە هێرشكردنە سەر خاكی(كمبودیە).

٢٥- له (٥سبتمبر) ساڵی١٩٧٣ (نیکسون)سەرۆکی ئەمریکا ئاگاداری و هەڕەشەی له ولأته بەرهەمهێنەکانی نەوت کرد له ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست له ئەگەری(سیاسەتی گرێدان و زیاد کردنی نرخی نەوت و بەکارهێنانی نەوت به مەبەستی سیاسی دەبێته هۆی لەناوچوونی بازاڕەکانیان).

٢٦- له(١١سبتمبر) ساڵی١٩٧٣: دەزگای هەواڵگری ئەمریکا هەڵسا به جێبەجێکردنی کودەتا دژ به(سلفادور الیندی)له ولأتی تشیلی...که دەرەنجامی ئەم کودەتایه بووه هۆی کوژرانی(سلفادور الیندی) و له سێدارەدانی(٣٠هەزار )کەس، و گرتن و کەوتنه زیندانی(١٠٠هەزار) کەس.

٢٧- له (٢٣یونیو) ساڵی ١٩٧٧: لێژنەی(اعتمادات)له کۆبوونی پیرانی ئەمریکا ڕەتی کردەوە که بەرهەمهێنانی قومبەڵەی(نیترون)بوەستێنێت، که بۆمبێکی ترسناکه و مرۆڤ دەکوژێت بەبیٚ زیان گەیاندن به دام و دەزگا و باڵەخانه.

٢٨- له(١٤یولیو) ساڵی١٩٧٧ ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا ڕازی بوو لەسەر بەرهەمهێنانی بۆمبی نیترون، که (کارتر) سەرۆکی ئەمریکا دووپاتی کردەوە که پەرەدان به بەرهەمهێنانی ئەم بۆمبه (٤٦ملیۆن) دۆلاری له خەزێنەی ئەمریکا پێویسته لەو کاتیەوە تاوەکو ساڵی ١٩٨٠.

٢٩- له(٢اکتوبر) ساڵی١٩٧٨: سەرۆکی ئەمریکا دانی نا به بەکارهێنانی مانگی دەستکردی لەلایەن ویلایەته یەکگرتووەکان بۆ مەبەستی چاودێری و سیخوڕیکردن لەسەر یەکێتی سۆڤیەت و چەند ولأتێکی تر.

٣٠- له ساڵی١٩٧٨: دەزگای هەواڵگری ناوخۆی ئەمریکا (٩١١)کەسی کوشت له(غایانا)سەر به کۆمەڵەی(معبد الشمس) که قەسابخانەیەکی گەورەی بۆ دروستکردن، که دەزگای هەواڵگری ئەمریکا ڕایگەیاند که ئەم ڕووداوە ئینتیحار و خۆکوشتنی به کۆمەڵ بووە(واته خۆیان خۆیان کوشتووە به کۆمەڵ).

-٣١ لە (٢٠يناير) ساڵی ١٩٧٩:حکومەتی ئەمریکا داوای لە دەزگای هەواڵگری ناوخۆی ئەمریکا کرد کە لێکۆڵینەوە و دیراسەیەکی گشتی ئامادە بکات لەسەر کۆمەڵ و جەماعەتە ئیسلامیەکان لە هەموو دونیا.

-٣٢ لە(١٩اغسطس) ساڵی ١٩٧٩: (بريجنسكی)ڕاوێژکاری سەرۆکی ئەمریکا لە ئاسایشی نیشتیمانی ڕایگەیاند، کە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ماوەی دووساڵ دا هێزی فریاکەوتنی خێرا(قوه التدخل السريع)ی دروستکرد بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆی و هاوپەیمانەکانی بە شێوەیەکی چالاك لە ئەگەری ڕوودانی پێکدادان لەو ناوچانەی کە گومانی ئاڵۆزی لێدەکرێ.

-٣٣ لە (اكتوبر) ساڵی١٩٧٩: دەزگای هەواڵگری ئەمریکا هەڵسا بە تیرۆرکردنی(باك جون ڤی)سەرۆك کۆماری کۆریای باشوور.

-٣٤ لە (١٢نوفمبر) ساڵی١٩٧٩: ویلایەتە یەکگرتووەکان کەل و پەلی ئێرانی لە بانکەکان ڕاگرت و(تجمد)ی پێکرد، ئەمەش بەمەبەستی گەمارۆ و کپکردنەوەی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی.

-٣٥ لە(١٣ديسمبر) ساڵی١٩٧٩: ئیدارەی ئەمریکا بڕیارێکی دەرکرد بە دوورخستنەوەی دیبلۆماسە ئێرانیەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان.

-٣٦ لە کۆتایی (آذار) ساڵی١٩٨٠: ژمارەی کەشتییە جەنگیەکانی ئەمریکا لە کەناراوەکانی ئەمریکا بۆ (٣٠) کەشتی بەرزبۆوە.

-٣٧ لە (٣٠مارس) ساڵی ١٩٨٠: دەزگای هەواڵگری ناوخۆی ئەمریکا هەڵسا بە تیرۆرکردنی(المونسينور روميرو)سەرۆکی (اساقفة السلفادور)ئەمەش لە کاتێك پیرۆزیی و ڕێزێکی کەنیسەیی هەبوو.

-٣٨ لە(٢٥ابريل) سالی١٩٨٠ کۆمەڵەی(دلتا)ی ئەمریکی کە پێك هاتووە لە هێزە تایبەتەکان، هەڵسان بە دەستدرێژیکردن بۆ سەر خاکی ئێران بە بیانووی ئازادکردنی بارمتە ئەمریکیەکان لە باڵوێزخانە ئەمریکا لە ئێران... زۆر ئاماژە دەریخست کە ئەم کردەیە کودەتایەکە کە کۆمەڵێك بەکرێگیراوی ناوخۆی ئێران ئامادەکاریان کردبوو کە پێشتر ڕەوانەی ئێران کرابوون، لەگەڵ سەرخەرانی شا کە هەڵاتبوون لەکاتی شۆڕشی ئیسلامی بۆ دەروە، بەڵام ئەم کردەوەیە شکستی هێنا

-٣٩ لە (یونیو) ساڵی١٩٨١: حکومەتی ئەمریکا ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر ڕێکاری سەربازی نوێ، کە پێویستە هێزی ئەمریکا ئامادەیی هەبێت بۆ وەشاندن و

بەڕێوەبردنی دوو شەڕی گەورە لە یەك كات، یەكێكیان لە ئەوروپا ئەوەی تریان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست وەك نموونە.

٤٠- لە (ئاب) ساڵی١٩٨١: فرۆكەی ئوستوڵی شەشی ئەمریكا لە كەنداوی(سرت) دەستدرێژی كردە سەر دوو فڕۆكەی چاودێری لیبی و خستینیە خوارەوە.

٤١- لە (دیسمبر) ساڵی١٩٨١: كەتیبەی(أتلاكاتل)ی دڕەندە، سەر بە دەزگای چاودێری ناوخۆی ئەمریكا هەڵسا بە كوشتنی (١٠٠٠)كەس لە چەند كردەوەیەكی داگیركاری و سوتاندن لە (سلفادور).

٤٢- لە (٢٥فبرایر) ساڵی١٩٨٢:ئیدارەی ئەمریكا بڕیاری دا چەند ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ قەدەغەكردنی نەوتی لیبیا و قەدەغەكردنی كرین و فرۆشتن بە ماددە نەوتی و ئەلیكترۆنیەكانی لیبیا.

٤٣- لە(٨یولیو) ساڵی١٩٨٢: بەشێك لە ئوستوڵی شەشی ئەمریكا بە دووری كەمتر لە (٥٠كیلۆمەتر) گەیشتە كەناراوەكانی لوبنان، بۆ پشتیوانی كردنی هێزی سەهیۆنی و خاچپەرستی جولەكە كە هێرشیان كردە سەر لوبنان لە (٥یونیو) ساڵی ١٩٨٢.

وە لەم شەڕەدا ئیسرائیل بە پشتیوانی و پیرۆزبایی ئەمریكا لە هێرشی بۆ سەر باشوری لوبنان (١٧)هەزار موسڵمانی شەهید كرد.

٤٤- لە ١٩٨٢-١٩٨٣ لەكاتی ڕاهێنانی فراوان بۆ هێزی خێرای ئەمریكا(برایت ستار)، فرۆكە سەربازیەكان هەڵسان بە بۆردومانكردنی ناوچەكانی نزیك سنوری لیبیا بە قومبەڵەی(٥٢)وەكو ترساندن و كردەی خۆسەپاندن.

٤٥- لە (٢٥اكتوبر) ساڵی١٩٨٣: هێزی ئەمریكا هەڵسا بە هێرشكردنە سەر(غرینادا)كە بچوكترین وڵاتی جیهانە، بە شێوەیەكی زۆر دڕندانە ڕێز و گەورەیی ئەم وڵاتەی شكاند و كوشتار و كاولكاریەكی زۆری ناوە لە دانیشتووانی سڤیل كە هەڵسا بوون بۆ بەرگریكردن لە وڵاتی خۆیان....وە ئەمریكا دوورگە(جزیرە)شی

داگیرکرد... کە ئیدارەی ئەمریکا درۆیەکی بڵاوکردەوە گوایە قوتابیانی ئەمریکی تووشی مەترسی بوونە، ئەمەش وەکو پاساویك وابوو بۆ ئەم دژایەتیەی لەسەر دوورگە(جزیرە).

٤٦- لە( ٢٢مایو) سالی ١٩٨٤ سەرۆکی ئەمریکا(ریغان) بە (فهد بن عبدالعزین)ی راگەیاند کە ویلایەت یەکگرتووەکا ئەگەڕێ بە دوای هەڵسان بە کردەی سەربازی گەر پێویست بکات بۆ پاراستنی گوازراوەکانی نەوت.
٤٧- لە ١٣یونیو ساڵی١٩٨٥: ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکا ڕازی بوو بە پێشکەشکردنی (٢٧)ملیۆن دۆلار وەکو یارمەتی بۆ یاخیبووەکان لە(نیکاراجوا).

٤٨- لە(٢٠یونیو) ساڵی١٩٨٥: ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکا ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر دووبارە بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی پاش قەدەغەکردنی بۆ ماوەی ١٦ساڵ.

٤٩- لە( ٧ینایر) ساڵی ١٩٨٦:ئەمریکا کۆمەڵێك سزای دارایی سەپاند دژ بە لیبیا، وە کۆتایی هێنا بە پەیوەندییە ئابووریەکانی لەگەڵ ئەم وڵاتە.
٥٠- لە( ٢٤ ینایر) ساڵی١٩٧٦: ئوستولی شەشی ئەمریکا کۆمەڵێك کردەی دەمارگرتن و خۆسەپاند(استفزازی) بە شێوەی سەربازی لە ڕێگای ئاسمانەوە بەرامبەر کەناراوەکانی لیبیا لە دەریای ناوەڕاست ئەنجام دا.

٥١- لە مارس ساڵی ١٩٨٦: ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا ڕەزامەندی دەربڕی بە پێشکەشکردنی(١٠٠)ملیۆن دۆلار یارمەتی بۆ دەرچو و یاخیبوەکان لە (نیکاراجوا)
٥٢- لە(٢٣ابریل) ساڵی ١٩٨٦ (ریغان)هەڕەشەی وەشاندنی گورزی سەربازی لە سوریا و ئێران کرد ئەگەر جێگیر بێت کە تێوەگلاون لە کاری تیرۆرستی.

٥٣- لە( ٦مایو) ساڵی ١٩٨٦: وتەبێژی کۆشکی سپی جەختی کردەوە لەسەر ئەگەری کردەی سەربازی نوێ لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکان دژ بە لیبیا.
٥٤- لە( ١٠یولیو) ساڵی ١٩٨٦: وەزیری بەرگی ئەمریکا ئاشکرای کرد کە مەبەستیانە چەند کۆگایەکی نوێ دروست کەن بۆ هەڵگرتنی چەکی نەوەوی لە ٢٦ بنکەی ئاسمانی لە ئەورویا و ڕۆژهەلاتی ناوەراست.

٥٥- لە( ١٤ نوفمبر) ساڵی ١٩٨٦: سەرۆك(ریغان) کۆمەڵێك سزای ئابووری سەپاند دژ بە سوریا بەو بەهانەیەی کە وەك ئاماژەی پێئەکان یارمەتی تیرۆ ئەدا(حزب الله- حماس)

٥٦- لە(٧ابریل) سالی١٩٨٧ یاریدەدەری وەزیری بەرگری ئەمریکا بۆ کاورباری جیهان ڕایگەیاند کە هێزەکان ئەمریکا لە(هندوراس)دەمێننەوە بۆ ماوەیەکی دیاری نەکراو.

٥٧- لە( ٦یونیو) ساڵی١٩٨٧: کەشتی هەڵگری فرۆکەی ئەمریکی(ساراتوجا) و چەند کەشتیەکی جەنگی تر چوونە پاڵ ئوستولی ئەمریکی لە کەنداو.

٥٨- لە یونیو سالی ١٩٨٧: ویلایەتە یەککگرتووەکان بڕیاری دا کۆمەکی سەربازی و یارمەتی زیاتر بۆ هێزی سەربازی ئەرمیکا لە کەنداو بنێرێت کە لە شەش کەشتی جەنگی پیك هاتبوو.

٥٩- لە(١٧مارس) سالی ١٩٨٨: ویلایەتە یەکگرتووەکان چوار یەکەی سەربازی کە پێك هاتبوو لە(٣٢٠٠)سەرباز نارد بۆ (هندوراس)، دوای چەند کاتژمێرێك لە ڕاگەیاندنی واشنتۆن لە داگیرکردنی هندوراس لەلایەن نیکاراجوا.

٦٠- لە(٢ابریل) سالی١٩٨٨: وەزیری بەگری ئەمریکا بڕیاری دا هێز و کۆمەکی سەربازی زیاتر بنێرێت بۆ (بنما) بە مەبەستی دابینکردنی ئاسایشی زیاتر بۆ هێزە ئەمریکیەکان لە ناوچەی(قناة بنما)، وە بۆ پاراستنی هاولاًتیانی سڤییل و بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا.

٦١- لە(٢٦ابریل) سالی ١٩٨٨: سەرۆك(ریغان)ماوەی قەدەغەکردنی بازرگانی کە سەپاندبووی بەسەر (نیکاراجوا) بۆ ماوەی چوار سالً درێژکردەوە.

٦٢- لە( ٣یولیو) سالی١٩٨٨: یەکەکانی ئوستوڵی ئەمریکی فرۆکەیەکی نەفەر هەڵگری ئێرانیان خستە خوار لە کەنداو کە بووە هۆی گیان لەدەستدانی هەموو سەرنشینانی ناوی کە ژمارەیان (٢٩٨)کەس بوو.

٦٣- لە( ٢٠دیسمبر) سالی ١٩٨٩: هێزەکانی ئەمریکا هەڵسان بە هێرش کردنە سەر (بنما) بە فەرمانی(جورج بوش) سەرۆکی ئەمریکا، بۆ دەستبەسەر کردنی جەنەڕاڵ(مانویا نوریجا) و دادگایکردنی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان.

٦٤- لە(٧مارس) سالی ١٩٩٠: ویلایەتە یەکگرتووەکان ولاّتی (لیبیا)یان تۆمەتبار کرد بە دروستکردن و بەرهەمهێنانی چەکی کیمیای لە کارگەی(رابطة).

٦٥- لە ١٩٩٠: ویلایەتە یەکگرتووەکان کۆمەکیە سەربازی و داراییەکانی بۆ پاکستان ڕاگرت بە گومانی ئەوەی کە (اسلام اباد) لە هەوڵی پەرەسەندنی چەکی نەوەوی دایە.

٦٦- شەڕی ڤێتنام:

ڤێتنام لە ساڵی ١٩٩٥ ڕایگەیاند کە ژمارەی کوژراوەکانی لە شەڕەکانی ساڵی شەستەکان گەیشتۆتە(٥ملیۆن) کەس کە لە نێویاندا زۆربەی کەسی سڤیلی دوور لە شەڕ بووەتە قوربانی، لە کاتێك پێشتر وەزیری بەرگری (ماکنامارا) لە پەخشی تەلەفزیۆن ڕایگەیاند کە ژمارەی کوژراوان (٣ملیۆن) و(٤٠٠)هەزار کەسە.

٦٧- لە ١٩٩٦ ویلایەتە یەکگرتووەکانی سەندوقێکی دانا بە بڕی(٢٠)ملیۆن دۆلار بۆ تێکدان و کێشە خستنە سەر نیزامی ئیسلامی لە ئێران..

٦٨- وە سەربازانی ئەندۆنیسیا بە پشتیوانی ئەمریکا یەك ملیۆن خەڵکیان کوشت.

٦٩- بۆردومانی سەر یوغوسلافیا: ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی ئیدانەی بۆردومانە ئاسمانیەکانی کرد کە هێزی(ناتۆ)بە پشتیوانی ئەمریکا پێی هەڵسا لە ساڵی(١٩٩٩) کە بووە هۆی کوژرانی بەلایەنی کەم(٤٠٠)مەدەنی، وە بەزۆریش(٥٠٠٠)مەدەنی.

٧٠- وە لە شەڕی سۆماڵ سوپای ئەمریکا بە هەزاران کەسی مەدەنی کوشت لە کاتی هێرشەکانی بۆ سەر سۆمال، وە لە نەوەدەکان ئەمریکا هێرشێکی توندی بە مووشەکی(کرون) کردە سەر سودان و افغانستان، لە شەڕی سودان کارگەی دەرمانی بۆردومان کرد، وە زیاتر لە دووهەزار کەسی شەهید کرد.

٧١- وه ئیسرائیل به پاسەوانی و پێشوازی ئەمریکا له درێژەی هێرشه دڕندەکانی بۆ سەر فەلەستین قەسابخانەیەکی دروست کرد له ساڵی(٢٠١٤)که بیست هەزار ماڵی خاپور کرد و نزیکەی(٧هەزار)موسڵمانی شەهید کرد.
وه زۆرەبی ئافرەت و پیاو و منداڵ و پیری فەلەستین به چەکی ئەمریکی کوژراون.

بۆ زیاتر شارەزابوون له دەستخستنه سەربازیی و سیاسی و هەواڵگریەکانی ئەمریکا بۆ سەر ولأتان، ئەم کتێبه بخوێنەوه(تاريخ الولايات المتحدة منذ ١٩٤٥)

## کوشتنی بارمته و دیل:

کوشتنی گیراوانی شەڕ یەکێك لەنەریتەکانی ولأتانی ئەوروپا و ئەمریکا، که بەردەوام لێیانەوه گوێبیست ئەبین بانگەشەی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ ئەکەن له شەڕ دا و کوشتنی بارمته به(تاوانی جەنگ)ناو ئەبەن، له کاتێك ئەمه نەریتی خۆیان بووه و مێژوی ڕەشی خۆیان پڕیەتی له تاوان و خراپەکاری و شاهێدی ئەمه ئەدەن، ئەمەش چەند نموونەیەکی کەمه له تاوانی کوشتنی دیل له لأتانی ئەوروپا و ئەمریکا:

١- کارەساتی(اودوفیل-لا-هوبیرت)له فەرەنسا که(٨٠)سەربازی ئەڵمانی به دەستبەسەری کوژران.

٢- کارەساتی کەناری(اوماها)له فەرەنسا، که (٦٤)ئەڵمانی به دیلی کوژران.

٣- مێژونووسی ئەمریکی(جیمس وینجارتنر) ئەڵێت: له شەڕی دووەمی جیهان چەند بارمتەیەکی زۆر کەمی یابانیەکان لای ویلایەته یەکگرتوەکان ماوەتەوه، ئەوانی تر زۆربەیان کوژران ئەمەش بەهۆی دوو هۆکار: ١-بەرگری سەرسەختی یابانییەکان و ئامادەنەبوونیان بۆ تەسلیم بوون ٢-بیروبڕوای بەربلأوی

ئەمریکیەکان بەوەی کە یابانییەکان دەستەواژەیەکە لە(گیانلەبەران) یان(نا مرۆڤ)کە مافی مامەڵەکردنیان لەگەڵ نییە و یاساکانی بارمتە لەسەریان جێبەجێ نابێت، وە مێژونوس(فیرجیوسن)جەختی زیاتری لەسەر هۆکاری دووەم کردەوە و ڕایگەیاند کە هێزی هاوپەیمانان سەیری یابانییەکانیان ئەکرد وەك (نازییەکان)سەیری دوژمنەکانیان ئەکرد بەتایبەت(روس) کە بە(Untermenschen)لە قەڵەمیان ئەدەن ، واتە(مرۆڤ نین_نا مرۆڤی).

٤- کارەساتەکەی(کانیکاتی)لە ئیتاڵیا ڕووی دا لەسەر دەستی عەقید(جوزێف مکافری).

٥- کارەساتی(داتشاوی)لە ئەڵمانیا.

٦- کارەساتی(بیسکاری)لە ئیتاڵیا.

٧- کردەی(teardrop)کە هەشت دەریاوانی ئەڵمانی تێیدا کوژران، لە دوای دەستبەسەرکردنیان، لە کاتێك ڕزگاریان بوو لە نقومبوون لە کەشتیەکەی ئەڵمانی.

وە چەندان نموونەی تر تایبەت بە ئەمریکا کە زۆربەی بارمتەکانی کوشتووە، وە سوکایەتی و گاڵتەی بە لاشەی مردووەکان کردووە بە تایبەت هیندییە سوورەکان کە ئەهاتن و ئاهەنگیان سازئەکرد و لە بەرچاوی خەڵك بە کۆمەڵ دەیان کوشتن، لە بابەتەکانی دواتری ئەم کتێبە زیاتر و زۆرتر لەسەر ئەم بابەتە ئەدوێین لە باسی دڕندەیی ئەمریکا بەرامبەر هیندییەکان.

## دیاردەی کوشتن لە ئەمریکا:

دیاردەی کوشتن لەناو ئەمریکا یەکێکە لە دیاردە هەر بەر بڵاوەکان کە ئەمریکا گیرۆدەی بووە و ساڵانە سەدان کەس ئەکوژرێ، ئەمەش چەند نموونەیەکی کەمە:

١- بەپێی ئامارێك لە ساڵی ١٩٨٥: (٢٩٢٨)کەس کوژراوە لەسەر دەستی تاکێك لە تاکەکانی خێزانەکەی.

٢- لە ١٦اکتوبر/تشرين الأول ساڵی ١٩٩١:پیاوێك ٢٢ کەس دەکوژێت لە چێشتخانەیەك لە ناوچەی(کیلن)لە تەکساس، وە بیست کەسیش بریندار ئەکا پێش ئەوەی فیشەك بنێ بەخۆی و خۆی بکوژێت.

٣- لە ٢٠ابریل/نیسان ساڵی ١٩٩٩:دوو قوتابی(١٧ساڵ و ١٨ساڵ)لە قوتابخانەی دواناوەندی(کولومباین)لە ویلایەتی(کولورادو)دەستڕێژی گوللە ئەکەن لە هاورێکانیان لە قوتابخانە و (١٢)قوتابی و مامۆستا ئەکوژن دواتر خۆشیان ئەکوژن.

٤- لە٢٩یولیو/تموز ١٩٩٩: پیاوێك لە بۆرسە کار دەکات بەناوی(مارك برثون) تەمەن(٤٤)ساڵ لەماڵەکەی خۆی لە(أتلانتا)لە(جۆرجیا) خێزان و دوو منداڵەکەی ئەکوژێت ، پاشان دەستڕێژی گوللە ئەکات لە دوو کۆمپانیا کە دەبێتە هۆی کوژرانی (٩کەس) دواتر خۆشی ئەکوژێت.

٥- لە ٢١مارس/اذار ٢٠٠٥:گەنجێکی تەمەن(١٦)ساڵ لە ویلایەتی(مینیسوتا) نۆ کەس لە قوتابخانەکەی دەکوژێت کە پێنجیان قوتابی دواناوەندی بوون، پاشان خۆشی ئەکوژێت

٦- لە ١٧ابریل/نیسان ٢٠٠٧: قوتابیەکی تەمەن(٢٣)ساڵ (٣٢ کەس) دەکوژێت کە (٢٧) یان قوتابین، پاشان خۆشی دەکوژێت لەناو حەرەمی کۆلێژی(فرجینیا)تایبەت بە تەکنەلۆژیا، کە ئەم کارەساتە بە خراپترین کارەسان دادەنرێت لە مێژووی ویلایەتە یەکگرتووەکان.

٧- لە ١٠دیسمبر/کانون الأول ٢٠٠٧: کوژرانی سێ کەس بە گوللە، وە برینداربوونی چەند کەسانێکی تر لە ویلایەتی(کولورادو)لە ڕووداوێکی تەقەکردن.

٨- لە ٢٤دیسمبر/کانون الاول ٢٠٠٨: پیاوێك خۆی داپۆشیبوو بە جلی بابانوئێل دەستڕێژی گوللەی کرد لە چەند کەسانێك کە ئاهەنگیان ئەگێڕا بەبۆنەی سەری ساڵ لە کەنارەکانی(لوس انجلوس) (٩کەس)ی کوشت، دواتر خۆشی کوشت.

٩- لە ١٠مارس/اذار ٢٠٠٩: (میکاییل کیکلندن)تەمەن(٢٨)ساڵ (١٠ کەس)ی کوشت کە دایکی و پوریشی لە نێو کوژراوەکان بوون لە سێ گوندی ویلایەتی(الباما-باشوور) پاشان خۆشی کوشت.

١٠- له ٣ابريل/نيسان ٢٠٠٩: کۆچبەرێکی بە ڕەگەز ڤێتنامی بەناوی(جیفرل یوونغ)تەمەن(٤١)ساڵ دەستڕێژی گوللەی کرد له ناوەندیکی وەرگرتنی کۆچبەران له(نیۆرك)و (١٣کەس)ی کوشت.

١١- له٥نوفمبر/تشرين الثاني ٢٠٠٩:پزیشکێکی دەروونی دەستڕێژی گوللەی کرد له بنکەیەکی سەربازی له (تەکساس) و (١٣کەس)ی کوشت و زیاتر له(٤٠کەس)یش بریندار بوون.

١٢- له ١٢ اكتوبر/تشرين الأول ٢٠١١:پیاوێك دەستڕێژی گوللەی کرد له ساڵۆنێك له کالیفۆرنیا هەشت کەسی کوشتن که له نێویاندا هاوسەری پێشووی تێدابوو.

١٣- ٢ابريل/نيسان ٢٠١٢:پیاوێکی کۆری تەمەن(٤٣)ساڵ حەوت کەس ئەکوژێت و سێ کەسیش بریندار ئەکات له ناو کۆلێژی ئاینی له(کالیفۆرنیا) پاشان خۆی ڕادەستی پۆلیس دەکات.

١٤- له٢٠يوليو/تموز ٢٠١٢:پیاوێك هێرش دەکاته سەر پێشبڕکێیەکی سەمایی لەکاتی پێشکەشکردنی فیلمی(باتمان) له(اوروار)له ویلایەتی(کولورادو)، (١٢)کەس ئەکوژێت وە دەیانی تر بریندار ئەکات، ئەمەش پاش ئەوەی بۆمبێکی گازی دەستی فرێئەداته ناو هۆڵێکی قەڵەباڵەغ.

## خۆکوشتن(انتحار) لەنێو سەربازانی ئەمریکا:

دیاردەی خۆکوشتن لەناو کۆمەڵگای ئەمریکا و بەتایبەت سەربازانی ئەمریکی بوەته دیاردەیەکی بەربلاو که دەسەلاّتدارانی ئەمریکا پێوەی ئەناڵێنن و دەستەوەستان وەستاون بەرامبەر ئەم دیاردەیه و به هەزاران ملیۆن دۆلاریان لەم پێناوە خەرج کردووە بەلاّم تاوەکو ئێستاش نەیانتوانیوە ئەم دیاردەیه کۆتایی پێبێنن ، به تایبەتی ئەو سەربازانەی بەشداری شەڕی عێراق و ئەفغانستانیان کردووە، که پسپۆران ئاماژە بەوە ئەکەن که(٣٠٠هەزار) سەرباز که پێشتر کاریان کردووە له

عێراق و ئەفغانستان ئەناڵێن بەدەست قەلەقی و ناتەواوی حاڵەتی نەفسی، ئەمە جگە لە دڵەڕاوکێی دووری خێزان و کەس و کار.

وە(کولونیل السبیث کامیرون ریتشي)لێپرسراو لە تەندوستی دەروونی سوپای ئەمریکا دەڵێت:(ئینتیحار و هەوڵدان بۆ خۆ کوشتن لە بەرزبوونەوەدایە لەگەڵ گرتنە بەری چەندین رێکار بۆ کەمکردنەوەی رێژەی خۆکوشتن).

## وە داتای گشتی:

بە پێی داتایەك کە رۆژنامەی(یو اس ایە تودای)ئەمریکی لە ژمارە بلاْوکراوەکانی لە (٩مارس) ساڵی ٢٠٠٥ بلاْوی کردۆتەوە: ساڵانە (٢٩هەزار) حاڵەتی ئینتیحار و خۆکوشتن لە ئەمریکا تۆمار کراوە کە رۆژانە ئەکاتە(٨٠)حاڵەت، کە ئەمەش بەهۆی نەخۆشی دەروونی و ناتەواوی حاڵەتی نەفسی و نەخۆشییە عەقڵی و نەفسییەکان روو ئەدات.

وە لە ساڵی٢٠١٠: بە پێی ئەم ڕیژەیەی کە مەرکەزی (cdc)بلاْوی کردۆتەوە نزیکەی (٣٨هەزار) و(٣٦٤) کەس لە ویلایەتە یەکگرتووەکان خۆی کوشتووە کە ئەم رێژەیە زیاترە لە رێژەی قوربانیانی هاتووچۆ کە(٣٣هەزار) و(٦٨٧)کەسی ئەمریکیە.

باشە ئێمە پرسیار لە هەموو ئەو کەسانە ئەکەین کە ئەمریکا ناوئەنێن بە(ڕزگارکەری ولاْتان)و(پارێزەری مافەکانی مرۆڤ)و(پارێزەرەی ستەم لێکراوان) ئەگەر سوپایەك ئەمە ناونیشانی بێت و ساڵانە هەزاران کەس لە سەربازان خۆیان بکوژن و کۆتایی بە ژیانیان بێنن؟؟؟؟!!!! وە ملیۆنان کەس لە ئەمریکا هەوڵی خۆکوشتن بدات؟؟؟!!ئایا شایستەی ئەو هەموو رێز و بەگەورە دانانەیە!!!!؟؟؟ ئەوەتا پسپۆڕی تەندروستی نەفسی لە رێکخراوی تەندروستی جیهانی(د.خوسیة مانویل برتولوني)ئەڵێت: لە نێوان ٢٠ ملیۆن بۆ ٦٠ملیۆن کەس ساڵانە هەوڵی خۆکوشتن ئەدات.

ئایا سوپایەك بۆ ڕزگارکردنی میللەتان هاتبێت کۆتایی بە ژیانیان دێنن؟؟!!

بەلأم نهێنی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ئەمریکا و هاوپەیمانان بۆ لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانان روویان کردۆتە ولأتان و شەڕەکەیان دژ بە تاقم و کۆمەڵەیەك نییە بەڵکو شەڕێکی ڕاستەوخۆیە دژ بە ئیسلام و موسڵمانان و نەهێشتنی حوکمی خوا لەسەر زەوی، وە با ئێمەش وا گومان نەبەین کاتێك سەربازانی ئەمریکا دێن بۆ ولأتانی موسڵمان و کاولکاری و خەڵکی بێتاوان ئەکوژن و شارەکان وێران ئەکەن خوای پەروەردگار فەرامۆشیان ئەکات!! نەخێر" لە دونیا و دواڕۆژیش سزاکەیان ئەچێژن، ئەو سەربازانەی بە دەستی موجاهیدان ئەکوژرێن ئەمە سزای کەمی دونیایانە، وە ئەوانەی ڕزگاریان ئەبێت ئەگەرێنەوە بۆ ولأتی خۆیان تووشی چەندەها نەخۆشی دەروونی و بێزاری و بیٚ هیوایی ئەبن لە ژیان، ئەمەش تۆڵەی ئەو هەموو خراپە و تاوانکاریەیە بەرامبەر بێدەسەلأت و لاوازەکان کردوویانە ئەوەتا خوا ئەفەرموویٚ:(وَمَنْ أعْرضَ عَن ذِكرِي فَإن لَهُ مَعيشةً ضَنكاً)واتە:(وە هەرکەسێك ڕوو وەرگێریٚ لە ڕێباز و یادی من ئەوە بێگومان ئەو کەسە ژیانی و گوزەرانێکی سەختی ئەبێت)

کەوابوو خۆشبەختی و بەختەوەری ڕاستەقینە تەنها لە پابەند بوون دایە بە پەیامی خوا و پەیوەست بوون بە ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوا، لە غەیری ئەمە مرۆڤ دڵی بە هیچ شتێك تا سەر سوکنایی نایێت.

وە لەم ساڵانەی دوایی بەهۆی پتر بوونی هێرشەکانی ئەمریکا بۆ سەر ناوچەکانی موسڵمانان و بەتایبەتی ساڵانی(٢٠٠٥)و(٢٠٠٦)و(٢٠٠٧) کاتێك هێرشە دڕندانەکانیان کردە سەر ئەفغانستان و دواتر بۆ سەر عێراق ژمارەی خۆکوشتن لەناو سەربازان بە بەردەوام لە زیاد بوون دایە، تاوەکو پزیشك و دەسەلأتداران زەنگی ئاگاداریان داوە!!!! ئەوتا پزیشك(توم فريدن)موديری ناوەندی(CDC)لە بەياننامەيەك ڕايگەياند و دەڵێت:(الانتحار بات مأساة شديدة الوتيرة) واتە:( ئينتيحار و خۆكوشتن بووە بە كارەساتێكی گەورە و مەترسيدار).

وە بە پێی ڕاپۆرتی پێشووی وەزارەتی بەرگی ئەمریکا جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی کە ڕێژەی حاڵەتی ئینتیحار لە نێوان سەربازانی ئەمریکا بەرزبۆتەوە بۆ سەدا ١٥٪ لە ساڵی ٢٠٠٦.

وە ڕاپۆڕتێکی زۆر ترسناك کە ناوەندی(سی بی إس)بلاّوی کردۆتەوە و کێشمە کێشم و قسەیەکی زۆری لەسەر دروست بوو کە ئاماژە بە چەند شتێك ئەدات:

ڕێژەی خۆکوشتن لە نێو سوپای ئەمریکا بە شێوەیەکی زۆر مەترسیدار لەبەرزبوونەوەدایە بەشێوەیەك کە ڕیژەی ئەو کەسانەی خۆیان ئەکوژن زیاترە لە ڕێژەی ئەو سەربازانەی لە عیراق شەڕ ئەکەن.

وە بە داتا ئاشکرا بوو کە زیاتر لە(٦٢٥٦)لە شەڕکەرانی ئەمریکی خۆیان ئینتیحار کردووە لە ساڵی(٢٠٠٥)، واتە ڕۆژانە(١٧)حاڵەت ڕووی داوە، وە ڕیژەی خۆکوشتن دوو هێندە زیاترە لە ڕێژەی خۆکوشتن لە نێوان هەموو چینەکانی تری ئەمریکی.

وە ئەم ناوەندە ئەمەشی ئاشکرا کردووە کە لە هەر چوار کەسی ئاژاوەگێڕ و تێکدەر یەکێکیان شەڕکەری سەربازییە، لەکاتێك ژمارەی شەڕکەران زیاتر نییە لە سەدا ١١٪ی کۆمەڵگای ئەمریکی.

## دەستدرێژی جینسی و ڕۆڵی ئافرەت لە ئەمریکا:

ئافرەت یەکێکە لە چینە گرنگەکانی کۆمەڵگا وەك وتراوە:ئافرەت نیوەی کۆمەڵگایە، ئەگەر سەیری ڕۆڵی ئافرەت بکەین لە کۆمەڵگای ئەوروپی و ئەمریکا بە تایبەتی ماف خوراوترین چینی کۆمەڵگا بوونە، با بێین بە پێی داتاکان سەیری ژیان وحاڵی ئافرەتانی ئەمریکی بکەین و بزانین ئایا ژیانی ئافرەتان بەم شێوەیە کە خەڵکانێکی ساویلکە و داماو لێی تێگەیشتوون و پێیان وایە ماڤ تەواو بەرجەستە سەرچاوەکەی ئەمریکایە، خۆشبەختی و سەروەری ئافرەت تەنها لە ئەمریکا و ولاّتانی ئەوروپایە، بەلاّم بە پێچەوانەوەیە ئەبینین بێبەشترین چین لە کۆمەڵگای ئەوروپا بە گشتی و ئەمریکا بە تایبەتی چینی ئافرەتن، ماف و سەروەری تەواوی ئافرەت تەنها لە

ئیسلام و بەرنامەی ئیسلام بەدی ئەکریٚ لە هەموو ڕژێم و دەسەلاٚت و دەستوورەکانی تر ئەبینین ستەم و کردەی نەشیاو بەرامبەر ئافرەت کراوە بەلاٚم ئیسلام هات و ڕیٚزێکی زۆر گەورەی لە ئافرەت نا کە ئێستا ئێمە ناتوانین زیاتر قسەی لەسەر بکەین و ئایەت و فەرموودەکان بێنینەوە، لەسەرچاوەی تر ئەتوانی زانیاری زیاتر بە دەست بێنیت.

## ڕێژەی پێکهێنانی خێزان:

لە لێکۆڵینەوەیەك هاتووە: کە لە ئەمریکا سەدا ٢٠٪ لە پیاوان ئامادەیی پێکهێنانی خێزانیان هەیە، وە سەدا ١٣٪لە ئافرەتان ئامادەیی پێکهێنانی خێزانیان هەیە، ئەمەش واتە سەدا ٨٠٪ی پیاوان وسەدا ٨٧٪ی ئافرەتان نایانەویٚ خێزان پێك بهێنن، ئینجا ئەی خوێنەری بەرێز خۆت ئەم ڕێژەیە هەڵسەنگێنە و مانای چی دەدات بەدەستەوە!!!؟؟؟؟

وە ئەبینین ڕێژەی دەستدرێژی بۆ سەر ئافرەتان لە ئەمریکا ڕۆژانە لە بەرزبوونەوەدایە و ئافرەتان تووشی گێچەڵی و نارەحەتییەکی زۆر ئەبنەوە تەنها لە ساڵی٢٠٠٧ نزیکەی(٢٤٨هەزار)و(٣٣٠)حاڵەتی دەستدرێژی تۆمارکراوە، ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئەمریکا بەردەوام بانگەشەی مافی مرۆڤ و مافی ئافرەت بە تایبەتی و سەربەخۆیی و ئازادی ئافرەت دەکات، لەکاتێك زۆربەی تاوان و دەستدرێژیەکان بۆ سەر ئافرەتە بە پێی داتایەك سەدا ٩٠-٩٥٪قوربانیانی توندوتیژی خێزانی لە ئەمریکا لە چینی ئافرەتانە.

بۆیە نەبوونی ڕەوشت و ئەخلاق بە تایبەتی بەرامبەر چینی ئافرەت نیشانەی لەناوچوون و دواکەوتووی ئەم کۆمەڵگایە دەردەخات لە ڕووی ئەخلاف و فیکر و ڕۆشنبیری، بۆیە شاعیر (احمد شوقي) دەڵێت:

(إنما الأمم الأخلاق ما بقيت.... فإن هم ذهبت أخلاقهم ذهبوا)

واتە:(میللەتان بە ئەخلاق و ڕەوشتەوە وەستاون.....گەر ئەخلاق و ڕەوشت نەما ئەم میللەتە بەرەو هەڵدێر و لەناوچووون ئەڕوا)

وە هەروەها کۆمەڵگای ئەمریکا هیچ ڕێز و بەهایەك بۆ ئافرەت دانانێن بەڵکو وەك کەل و پەل و ئامرازێك مامەڵەی لەگەڵ ئەکەن ئەوەتا تەنها  لە ساڵی ١٩٨٦: سەدا ٢٧٪لە دانیشتوانی ئەمریکا لەسەر حیسابی ئافرەت ژیاون.

## ڕێژە و داتاکان پەیوەست بە دەستدرێژی و گێچەڵی سێکسی بەرامبەر ئافرەت:

- ڕۆژنامەی(تایم)ئەمریکی ئەڵێت: لێکۆڵینە نوێیەکان لە (ناوەندە پەیوەندیدارەکان بە نەخۆشیەکان)  لە ویلایەتە یەککگرتوەکان ئاشکرای کرد کە لە هەر پێنج کچی ئەمریکی کچێك تووشی دەستدرێژی و(اغتصاب) ئەبێتەوە، وە نزیکەی سەدا٤٠٪ی کچان لە ئەمریکا تووشی توندوتیژی سێکسی ئەبنەوە.

- وە(٧٨)ئافرەت لە هەر کاتژمێرێك لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا تووشی دەستدرێژی ئەبنەوە، بەم شێوەیە لە هەر ڕۆژێك(١٨٧١)ئافرەتی باڵغ لە ئەمریکا ئیغتیصاب ئەکرێ، کە مانگانە ئەکاتە (٥٦٩١٦)ئافرەت.

- وە لێکۆڵینەوەکان ئەوەشیان ئاشکرا کردووە کە سەدا ٩٠٪حاڵەت دەستدرێژیەکان پێشتر پیلانی بۆ داڕێژراوە، وە سەدا٨٧٪لە حاڵەتەکان کەسی دەستدرێژ کار چەکی هەڵگرتووە و هەڕەشەی کوشتنی لە قوربانیەکە کردووە ئەگەر بەرگری بکات و لاملی بکات و گوێڕایەڵ نەبێت.

- وە سەدا٨٠٪ی ئافرەتانی ئەمریکی لە هەموو ژیانیاندا جارێك  هەر تووشی ئیغتیصاب و دەستدرێژی ئەبنەوە.

- ناوەندی قوربانیانی نیشتیمانی(مرکز الضحایا الوطني) ڕایگەیان کە لە هەر هەشت کچی باڵغ کچێك تووشی دەستدرێژی ئەبێتەوە لە ویلایەتە یەککگرتووەکان.

– ئامارەکان ئاماژە بەوە ئەکەن کە ساڵانە لە ئەمریکا نیو ملیۆن کردەی دەستدرێژی تۆمار دەکرێت، وە سەدا٦١٪ی کچانی ئەمریکی کچێتی خۆیان لە دەست ئەدەن پێش تەمەنی ١٢ ساڵی.

– سەدا٢٠٪ئەو ئافرەتانە دەستدرێژیان ئەکرێتە سەر لەلایەن باوکیانەوەیە.

– لە ساڵی ١٩٨٥: (٢٩٢٨)کەس کوژراوە لەسەر دەستی تاکێك لە تاکەکانی خێزانەکەی.

– لە هەموو سەعاتێکدا(٧٨)حاڵەتی دەستدرێژی ڕوودەدات لە ئەمریکا.

– لە ساڵی (١٩٩٠) داتای حاڵەتە دەستدرێژیەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرزبۆوە بۆ(١٠٠هەزار) کە ئەمە یەکەم جارە لە مێژووی ئەمریکا کە ڕێژەی دەستدرێژی چوار هێندەی تاوانەکانی تر بەرزبووەوە لە مەڕ دە ساڵی ڕابردوو.

– لە ١٩٩٥: زیاتر لە(٩٥)هەزار تاوانی دەستدرێژی ئەنجامدراوە، کە سەدا ٨٠٪لەناو خێزان و هاوڕێی و هاودۆستەکان ڕوویداوە، لەکاتێك پۆلیس ئەڵی ژمارەی ڕاستەقینە(٣٥)هێندەیە.

– لە ساڵی ١٩٩٧:بە پێی ووتەی دەزگاکانی بەرگری ماڤ ئافرەت لە هەر سێ سانیەیەکدا ئافرەتێك دەستدرێژی ئەکرێتە سەر، لەکاتێك دەزگا ڕەسمیەکانی ئەمریکا ئەمەیان ڕەت کردۆتەوە و بە زۆریان داناوە، بەڵکو ئەڵێن ژمارەی ڕاستەقینە لە هەر(٦)سانیەیەکدا ئافرەتێك دەستدرێژی ئەکرێتە سەر نەك سێ سانیە!!!!!؟؟؟

## لێدان لە ئافرەت:

– لە ساڵی ١٩٩٧: (٦ملیۆن)ئافرەت بە هۆی خراپ مامەڵەکردنی لاشەیی و دەروونی لەلایەن پیاوانەوە ئەناڵێنن و ئازار دەدرێن، وە سەدا٧٠٪ی هاوسەران تووشی لێدانی ترسناك بوونەتەوە، وە ساڵانە(٤هەزار) ئافرەت ئەمرێت بەهۆی لێدان و ئازاردان بەدەستی هاوسەرەکانیان یان ئەو کەسانەی کە ژیانیان لەگەڵ ئەبەنە سەر.

## ئافرەتی داوێن پیس لە ئەمریکا:

- لە ساڵی ١٩٨٠ تاوەکو ساڵی ١٩٩٠ لە ویلایەتە یەکگرتووەکان: نزیکەی یەك ملیۆن ئافرەتی داوێن پیس بوونیان هەبووە کە کاری داوێن پیسیان ئەنجام داوە.

- وە لە ساڵی ١٩٩٥: خەرجی دەزگا داوێن پیسیەکان و دەزگا ڕاگەیاندنەکانی پەیوەستدار بە بواری سێکس گەیشتە(٢٥٠٠)ملیۆن دۆلار.

## گێچەڵی سێکسی لە قوتابخان و کۆلێژەکان:

لێکۆلینەوەیەك دەری خستووە لە ساڵی ٢٠٠٢ کە (کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ دەزگا پەروەردەییەکان بۆ ئافرەتانی پەیمانگا) پێی هەڵساوە لەسەر قوتابیانی پۆلی هەشت تا یازدە ئەنجام دراوە دەرکەوتووە کە سەدا ٨٣٪لە کچان تووشی گێچەڵی سێکسی بونەتەوە لە قوتابخانە.

وە(الیزابیث دایفیس)کە قوتابی پێشووی فرۆکەوانییە لە(کولورادو) بەرامبەر لێژنەی ئەمنی قەومی و پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان لە ئەنجوومەنی نوێنەران ووتی:(زۆربەی ئەوانەی دەستدرێژیان ئەکرێتە سەر فەرماندە قوتابیە ڕەگەز مێینەکانن لە قوتابخانە سەربازییەکان).

## دیاردەی منداڵ لەباربردن و ڕێژەی تەڵاق:

- ساڵانە لە ئەمریکا یەك ملیۆن منداڵ ئەمرێت بەهۆی لەباربردن یان کوشتنی ڕاستەوخۆ دوای لە دایك بوون، (القاضي لندرس) ئەڵێت:(لە ئەمریکا ساڵانە یەك ملیۆن منداڵ لە بار ئەبرێت بەلای کەمیەوە ، وە بەهەزاران منداڵیش ئەکوژری ڕاستەوخۆ دوای لە دایك بوونی).

ئەمەیە ماف منداڵ لای ئەمریکا!!!!!!

- له ساڵی ١٩٨٠:(١ملیۆن)و(٥٥٣هەزار) حاڵەتی منداڵ له باربردن تۆمارکراوه، که سەدا ٣٠٪لەلایەن ئەو ئافرەتان تۆمارکراوه که تەمەنیان نەگەیشتۆته(٢٠ساڵ)، وه پۆلیس ڕوونکردنەوه ئەدات وئەڵێت:ژمارەی ڕاستەقینه سێ هێندەیه.
- له ساڵی ١٩٨٢: سەدا٨٠٪ له خێزانداره‌کان له ماوەی ١٥ساڵ تەڵاقدراون و ژیانی هاوسەریان هەڵوەشاوەتەوه.

- ڕێژەی تەلاق له ئەمریكا گەیشتۆته سەدا٦٠٪.

- وه له ساڵی(١٩٨٤): (٨ملیۆن) ئافرەت به تەنیا ژیانیان بردۆته سەر لەگەڵ منداڵەکانیان به بێ هیچ یارمەتیەکی دەرەکی.

وه سەدا ٥٤٪ی ئافرەتان تەڵاقدراو دانیان ناوه بەوەی که هاوسەرەکانیان پەیوەندی جینسیان هەبووه لەگەڵ کەسانی تر.

وه سەدا ٤٦٪له پیاوان که هاوسەرەکانیان تەڵاقداوه دەڵێن:هۆی تەڵاقدانی خێزانەکانیان پەیوەندی جینسی بووه لەگەڵ کەسانی تر.

وه سەدا ٣١٪ له ژن و مێرده ئەمریکیەکان بەشێوەیەکی بەردەوام پەیوەندی نا شەرعییان هەیه لەگەڵ کەسانی تر.

## خانەی داڵدەدان:

- تەنها له ویلایەته یەکگرتووەکان (١٤٠٠)خانەی داڵدەدانی ئافرەتان هەیه، که تایبەته بەو ئافرەتانەی لێیان ئەدرێت یان ڕائەکەن له هاوسەرەکانیان و هیچ شوێن و پەناگەیەکیان دەست ناکەوێت لای خێزان و کەسه نزیکەکانیان.

- وه ڕێکخراوه نا حکومیەکان ئەڵێن: ساڵانه له ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریكا(٧٠٠)هەزار حاڵەتی گێچەڵی جینسی(تحرشی جنسی)هەیه، وه ئەم ڕێکخراوانه ئاماژه بەوەش ئەدەن که سەدا ٦١٪له قوربانیانی دەستدرێژی سێکسی هەواڵ نادەن بەوەی که تووشیان بووه، بۆیه ئەو ژمارەی له لێکۆڵینەوەکان باس ئەکرێ زۆر زۆر کەمتره له ڕێژەی ڕاستەقینه که بەکردار ڕوو ئەدات.

– وە هەروەها بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکی کە لە کۆتایی ساڵی ٢٠١١ ئەنجامدرا و ڕۆژنامەی(نیویورك تایمز)بڵاوی کردەوە: لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەر سێ ئافرەت ئافرەتێك تووشی گێچەڵی سێکسی ئەبێتەوە ئەمەش لەکاتێکدا کە لە هەر پێنج ئافرەت ئافرەتێك تووشی دەستدرێژی بە کردار ئەبێتەوە.

## دەستدرێژی بۆ سەر ئافرەت لە شوێنی کار:

– بە پێی ئاماری ڕێکخراوی(لوبي النساء)کە پەیوەندداره بە بابەتەکانی ئافرەت لە ئەوروپا ڕایگەیان کە: سەدا٤٠٪ بۆ سەدا٥٠٪ ئافرەتی ئەورووپی تووشی گێچەڵی سێکسی ئەبنەوە لە شوێنی کارەکانیان.

– وە لە ئەمریکا سەدا٣١٪ی ڕەگەزی مێینە تووشی گێچەڵی سێکسی ئەبنەوە لە شوێنی کارەکانیان.

وە زۆربەی ئافرەتانیش هەواڵ نادەن بەوەی کە تووشیان دەبێت لە ترسی دەرکردن و دوورخستنەوەی لە کار و پیشەکەیان.

سەیری ئەم کتێبە بکە:(كتاب الإحصاء الوطني الصادر ١٩٩٧ عن إدارة الاقتصاد والإحصاء في مصلحة التجارة الأمريكي)

## دڕندەی ئەمریکا بەرامبەر هیندیەکان و لەناوبردنیان:

هیندیە سوورەکان دانیشتوانی ڕەسەنی ئەمریکا بوون پێشتر بەڵام لەسەر دەستی ئەورووپییەکان کە کۆچیان کرد و هاتن بۆ خاکی ئەمریکا و (دانیشتوانی ئێستای ئەمریکا ئەگرێتەوە) تووشی کوشتار و کاولکاری و تاوانکارییەکی زۆر بوونەوە بە ملیۆنان هیندییان کوشت و دەربەدەر کرد، بەڵام مێژوونوسانی ئەمریکی هاتوون بەشێوەیەکی نا دادپەروەرانە ویستوویان ئەم تاوانکاری و کوشتارە بشارنەوە یان کەمی بکەنەوە کە ڕێژەی قوربانیان و کوژراوانیان تەنها بە دوو ملیۆن هیندی لەقەڵەم داوە، دواتر ئەم ڕێژەیەشیان لە ئامارێکی ساڵی( ١٩٠٠) کەمکردەوە بۆ یەك

ملیۆن کوژراو[٩]، بەلاّم ژمارەی ڕاستەقینە ئێجگار ئێجگار زیاتر و زۆرترە، وەك لێکۆڵەر (منير الحمش) پێی وایە ڕێژەی دانیشتوانی ڕەسەنی ئەمریکا کە هێرشبەرانی ئەورووپی لەناوی بردون زیاترە لە سەد ملیۆن هیندی سوور[١٠].

وە لە سالی(١٨٤٦)سوپاس ئەمریکا (کالیفۆرنیا)ی داگیر کرد و ئامارەکان ئەڵێن: لەم جەنگەدا ئەمریکا توانی سەدا ٨٠٪ی هیندییەکانی کالیفۆرنیا لەناوببات و ئەوانی تریش تووشی چەندان کاری قورس و گران بوونەوە کە بەهۆیەوە بەرەو لەناوچوون هەنگاویان نا.

وە زۆربەی هیندیەکان تووشی کۆچرەویەکی ناچار بوونەوە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە بۆ ناوچە دوور و خراپەکان، وە دەقی یاسایشیان لەم بوارە دەرکرد لە کالیفۆڕنیان لە یەکەم دانیشتنی سالّی( ١٨٥٠) پەرلەمان یاسای دەرکرد کە کۆچکردن و فراندنی کچان و کورانی هیندی دروست و ئاساییە بەکارێکی یاسایی، بۆیە بەم هۆیەوە چەندین هەزار کەس تووشی کۆچکردن بوونەوە و بوون بە کۆیلە و لەبازاڕەکان ئەفرۆشراون و لەناوچوون.

وە لە سالی(١٨٣٠) کۆنگرێسی ئەمریکا بریاری دا کە هیندیەکان بە توندی کۆچیان پی بکریّ، وە ماڤ ئیستیعماری ئەمریکایە کە هیندیەکان لە زەوی خۆی دەرکات، وە بیان کوژێت گەر بیەوێت، هەر لەم ڕۆژەی کە ئەم بریارە دەرکرا هێزی نیزامی ئەمریکا (٥)شەعبی هیندی (شیروکی–شوکتو–سیسکومسو–الكريك–سیمیتول) بە تەواوی لەناوبرد کە بەشێوەیەکی دڵ ڕەقانە دەریان کردن بۆ ئەو ناوچانەی کە نەخۆشی کولێرای تێدا بلاّوبوبووەوە.

---

[٩] ئەگەر بەقسەی خۆشیان بێت کە یەك ملیۆن هیندی کوژراون، ئایا کوشتنی یەك ملیۆن مرۆڤ تاوان و جەریمە نییە!!!!!!!

[١٠] منير الحمش – أمريكا والكنانيون الحمر – دراسة منشورة بمجلة أخبار الأدب – دمشق – ٢٠٠٢/٦/٩م – .

وە هەروەها ئەو تاوانانەی لە ساڵی(١٧٧٦) کە دژ بە هیندیەکانی شیرۆکی ئەنجام درا، چەندان شارۆچکە و دێهاتیان سوتێنرا و بەربووم و داهاتەکانیان بەهەدەر درا و ئاوارە کران، وە ئەو کاتەی (جورج واشنتن) فەرمانی بە سەربازان کرد کە ماڵ و زێدی هیندیەکانی(الاوروکو)خاپوورکەن و شوێنەواری بسڕنەوە لەسەر زەوی، بۆیە هیندیەکانی(سینیکا)بە (جورج واشنتن) سەرکردەی جمهوری ئەمریکا ئەلێن(هدام المدن) (لەناوبەری شاران)، کە بە فەرمانی ئەو(٢٨)شاری هیندیەکانی (سینیکا) بە تەواوی وێران کرا، وە هەروەها شارەکانی(موهوك–أنونداغا–کایوغا)ش ویران کران، وە (جورج واشنتن) ناسراو بە(باوکی ئازادی ئەمریکی) بەتەنیا لە بێستانە تایبەتەکەی خۆی سێ هەزار کۆیلە و جاریەی هەبوو.

**ئەمەیە ماف مرۆڤ و ئازادی لای ئەمریکا!!!!!!!!!!??????**

وە سەرکردەکانی دواتریش لەسەر هەمان ڕێگا ڕۆیشتن (توماس جیفرسون)ناسراو بە (نێردەی ئازادی ئەمریکی) فەرمانی بە وەزیری بەرگری کرد کە بە توندرین شێوە ڕووبەڕوی ئەو هیندیانە ببنەوە کە دژ بە فراونخوازی ئەمریکی ئەوەستنەوە ، وە ووتی:(بەڵێ ئەوان چەند کەسانێکی ئێمە ئەکوژن، بەڵام ئێمە لەناویان ئەبەین و شوێنەواریان لەسەر زەوی ڕەش ئەکەینەوە)

وە لە ساڵی(١٦٣٦)یەکەم بەڵگەنامە دەرکەوت کە دەیسەلمێنی ئەمریکا چەکی میکرۆبی بە ئەنقەست بەکارهێناوە.

## دڕندەیی ئەمریکی سپی پێست:

جیاوازی لەسەر ڕەنگ یەکێکە لە کێشە و ململانێ گەورەکانی ئەمریکا کە ڕق و قین لەناو هەموو چینەکانی ئەمریکا بڵاوبۆتەوە،بە تایبەتی سپی پێستەکان زۆر بەچاوێکی کەم و ناشیرین سەیری ڕەش پێستەکان ئەکەن تاوەکو گەیشتووە بەوەی

بە ئاژەڵ ناوزەندیان بکەن و پێیان وایە ڕەش پێستەکان ژیان و بونەوەریان ناشیرین کردووە و پێویستەیەکی ئەخلاقییە کە لەناو ببرێن ئەوەتا_یەکێك لە پزیشکە ئەمریکییە سپی پێستەکان کە لە ساڵی ١٨٥٥ یەکێك بووە لە هەرە بەناوبانگترین پزیشکەکانی سەردەمی خۆی ئەڵێ:

(لەناوبردنی هیندیە سورەکان چارەسەرێکی پێویست بوو، وە ڕاوکردنیان وەکو ڕاوکردنی گیانلەبەرە دڕندەکان وایە لە دارستان و پێویستیەکەی ئەخلاقییە بۆ ئەوەی مرۆڤی سپی پێست بە کردار لەسەر زەوی بمێنێتەوە لەسەر وێنەی خوا) (نعوذ باللە)

هەر بۆیە لە یەکێك لە شەڕەکان کە تەنها ماوەی سێ ڕۆژی خایاند ئەمریکا (٤٥هەزار) ئەفریقی ڕەش پێستی کوشت.

وە(فرانسیس پارکین) بەناوبانگترین مێژوونووسی ئەمریکی لەسەردەمی خۆی دەڵێت:( إن الهندي نفسه في الواقع هو المسئول عن الدمار الذي لحق به لأنه لم يتعلم الحضارة ولابد له من الزوال ... والأمر يستأهل)

واتە:(هیندییەکان خۆیان لەم ڕۆژگارە بەرپرسن لەم کاولکارییەی کە تووشیان هاتووە چونکە فێری پێشکەوتن نەبوونە و هەر ئەبێت لەناوچن...وە ئەم سزایە شایستەیانە)

بەلاَم ئەگەر بێتوو سەیری دەقە شەرعییەکانی ئیسلام بکەین ئەبینین ئیسلام ئەم جیاوازیەی ڕەت کردۆتەوە و هەموو مرۆڤەکانی بێ جیاوازی وەك یەك داناوە و بەڕێزی و سەروەری تەنها لە تەقوا و و پابەندبوون بە ئیسلامەوە، وە ئەم جیاوازی ڕەنگ و زوبانانە یەکێکە لە نیشانە و بەڵگەکانی خوا و بۆ ئەوەیە یەکتر بناسین و گەورەیی خوامان زیاتر بۆ دەرکەوێت ئەوەتا خودا ئەفەرمووێ:( ياأيُّها النَّاس إنَّا خلقْناكُم من ذَكرٍ وأنْثَى وجَعلْناكُم شُعوباً وقَبائِل لِتَعارفُوا إن أكْرمَكُم عِندَ اللهِ أتْقكُم...) واتە:(ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێر و مێ، وە

کردوومانن بە چەند گەل و هۆزێك تا یەکتری بناسن، وە بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا پارێزگارترینتانە)

وە دەفەرمووێ:(ومِن آياتِه خَلق السَّموات والأَرضِ واخْتِلافُ أَلْسنَتكُم وألوانِكُم إنَّ في ذلك لآيَاتٍ لِلعالمين)  واتە:(لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوا دروستکردنی ئاسمانەکانە و زەویە، وە جیاوازی و لێکنەچوونی زمانی قسەکردن و ڕەنگەکانتان، وە بەڕاستی لەمەشدا چەند نیشانەی گەورە هەیە بۆ زانایان)

وە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ:(الناس سواسية كأسنان المشط) واتە:(خەڵك یەکسانن وەك ددانی شاش)

وە دەفەرمووێ:(لا فضل لعربي على الأعجمي الا بالتقوى)واتە:(ڕێز و شکۆ بۆ عەرەب نییە لەسەر غەیرە عەرەب تەنها بە خۆپارێزی و تەقوا نەبێت).

## لەناوبردن و نەهێشتنی شارستانیەتی هیندیەکان:

(هولیود) وەکو نەریتی خۆی هەڵسا بە لەناوبردن و شێواندنی شارستانیەتی هیندیەکان و وێنا کردنیان بە وەحشیگەر و تێکدەر و خوێن ڕێژ ، وە وێنکا کردنیان بەوەی هیندیەکان  سوکایەتیان بە لاشەی سپی پێستەکان کردووە کە هاتوون بۆ ئەوەی شارستانیەت بلاو بکەنەوە، کە ئەمانە هەمووی  بوهتان و درۆی هەڵبەستراو بووە دژ بە شارستانیەتی هیندیەکان، وە نیشاندانی مرۆڤی سپی پێست بەوەی کە هاتوون هیندیەکانیان فێرە ژیان و کشتوکاڵ و بەربووم و شارستانیەت بکەن.

(جاك بیتی)کە دامەزرێنەی کیتابی(العملاق)ە، لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی شەریکەی(فرجینیا) لە ساڵی(١٦٢٤)هاتووە کە نێردراوە بۆ دەستەی  هەڵبژێردراوان لە لەندەن کە ئەمە دەقەکەیەتی:

(لەناوبردن و نەهێشتنی هیندیە سورەکان زۆر ئاسانترە لە هەموو هەوڵێك بۆ بە شارستانیکردنیان، ئەوان دڕەندە و نەزان و لەڕوو و لاواز  و دەشتەکی و ڕووتن، ئەمە وادەکات کە شارستانیکردنیان گران و قورس بێت، بەلاَم سەرکەوتن بەسەریان

ئاسانە، وە گەر بمانەوێ هەوڵی شارستانی کردنیان بدەین ماوەیەکی زۆر و درێژی پێویستە، وە لەناوبردن و ڕەشکردنەوەیان ڕێگایەکی کورتکراوەیە، وە ڕێگاکانی سەرکەوتن بەسەریان زۆرە وەك: بەکارهێنانی هێز- هێرشی لەناکاو- برسی کردنیان- سوتاندنی دەستکەوت و بەروبوومەکانیان- لەناوبردنی شار و دێهاتەکانیان- پارچە پارچە کردنیان).

## سوکایەتی کردن بە لاشەی مردووە هیندیەکان:

مرۆڤی ئەمریکی و ئینگلیزی سپی پێست تاونێك لە تاوانە قێزەونەکانی تریان ئەنجامدا دژ بە هیندییەکان، لە زۆربەی شەڕەکان هەڵدەستان بە لێکردنەوەی سەری هیندییەکان کە ئەمە بەشێوەیەك ڕەواجی پێدرا کە دەسەڵاتدارە داگیرکارەکان پاداشت و دیاریان بۆ ئەو کەسە دیاریکردبوو کە هیندییەك بکوژێت و سەرەکەی بێنێت لەگەڵ خۆی، کە ئەم پاداشتەش دەگەڕێتەوە بۆ ( ١٢ایلول سبتمبر)ساڵی( ١٦٦٤) کە بەشێوەیەکی دەستووری دادگای گشتی بڕیاری دا پاداشت بدا بەو کەسەی کە کەللەی سەری هیندیەك بێنێت ئینجا جیاوازی نییە کەللە سەری هەر هیندیەك بێت و لە هەر تەمەنێك بێت، وە پاداشتەکەش دیاریکرابوو بە پێی کەللە سەری کەسەکە، بۆ کەسی ئاسایی (٥٠٠)جونەیهی ئیستەرلینی دیاریکرابوو،وە(٢٠)جونەی بۆ پیاوە میلیشیاکان، وە (١٠)جونەی بۆ سەربازەکان، بەڵام دواتر لە ساڵی (١٧٠٤)گۆڕا و بوو بە (١٠٠)جونەی بۆ هەر کەللە سەرێك، وە لە هەمووی سەیرتر لە ساڵی(١٦٩٦) بڕی پاداشتی زۆر کەم دیاریکرابوو لە بەرامبەر کەللە سەری فەڕەنسی کە(٦)جونەی بوو.

وە دراماکار(لویس وتزل)بە شانازیەوە باسی دەستەکەوتەکانی خۆی ئەکات کە لە یەك ڕۆژدا (٤٠) کەللە سەری هیندی هێناوە و خۆی بە پاڵەوانی مێژوی ئەمریکا لە قەڵەم دەدات، کە پێی ئەوتریێ(عمالقة الثغور)، وە لە لای(وتزل)لێکردنەوەی سەری هیندی و دەرهێنانی کەللە سەر یەکێکە لە وەرزشە خۆشەویستەکان لای ئەمریکیەکان، وە هەروەها زۆربەی ئەمریکیەکان شانازی ئەکەن کە جل و بەرگ و

پێڵاوەکانیان دروستکراوی پێستەی هیندییەکان بێت، وە کاتیان دیاریکردبوو بۆ ئاهەنگ گێڕان و پیاو ماقوڵ و ناودارەکانیان بانگ ئەکرد کە سەیری ئەم کارە سامناکە بکەن کە دەرهێنانی کەللە سەری هیندیەکانە، تاوەکو(کولونیل جورج روجرز کلارك)ئاهەنگێکی ڕێکخست بۆ دەرهێنانی کەللە سەری(١٦)کەسی هیندی، وە داوای لە هەڵکەرانی سەری هیندییەکان کرد کە لەسەرخۆ کەللەی سەریان دەربێنن بۆ ئەوەی سەربازان تام و چێژ لەم دیمەنانە وەرگرن، وە تاوەکو ئێستاش(کلارك)وەکو نیشانە و ڕەمزێکی نیشتیمانی سەیر ئەکرێ لای ئەمریکیەکان، وە وەکو پاڵەوانێکی مێژوویی ناوبانگی دەرکردووە.

وە لەگەڵ دامەزراندنی سوپای ئەمریکا دیاردەی سوکایەتی و شێواندنی تەرم و لاشەی مردوو بووە بە دیاردە و بەشێوەیەکی ڕەسمی مامەڵەی لەگەڵ ئەکرا ، ئەیان هێنا لە پێش سەرۆك و کاربەدەستان کەللە سەریان دەرئەهێنا، سەرۆك(اندرە جاکسون)کە ئێستا وێنەکەی لەسەر پارەی بیست دۆلارییە یەکێك بووە لە عاشق و تامەزرۆکانی شێواندنی لاشەی مردوو، فەرمانی ئەکرد کە گوێ و لووتی هیندیەکان لێبکەنەوە، وە خۆی سەرپەرشتی ئاهەنگێکی کرد کە تەرمی(٨٠٠)هیندیان شێواند و سوکایەتیان کرد بە لاشەی مردووەکان، وە هەر لەم ئاهەنگە سەرکردەی ئەمریکی(جون شفنغنتون)کە یەکێکە لە گەورەترین پاڵەوانەکانی مێژووی ئەمریکا وە ئێستاش لە چەندین شار و شوێن باس و یادی ماوە کە دروشمە بەناوبانگەکەی ووتەوە:(هیندیەکان بکوژن.....پێستەکانیان داڕنن، گەورە و بچووکیان جێ مەهێڵن).

## سوکایەتی کردن بە ئافرەتی هیندی:

وە تا کار گەیشت بەوەی وەکو(اشبری) سەربازی ئەمریکی دەڵێت: ئەهاتن سوکایەتیان بە دامێنی ئافرەتە هیندییەکان ئەکرد، وە پیاوەکان شانازیان ئەکرد کێ زیاتر دامێنی ئافرەتی لایە، کلاوە جەنگیەکانیان پێ ئەڕازاندەوە، وە هەندێکیان لە جەژنەکان لەسەر ماڵەکانیان هەڵیان ئەواسی.

## دڕندەیی ئەمریکا بەرامبەر یابانیەکان:

دڕندەیی ئەمریکا تەنها بە لەناوبردنی هیندییە سوورەکان نەوەستاوە لە مێژوو لە چلەکانی سەدەی بیست یابان خسترایە ناو گەل و نەتەوە وەحشیەکان کاتێك ئەمریکیەکان جەختیان کردەوە لەسەر ئەوەی کە جومجومەی سەری یابانیەکان بەهەزارساڵ دواکەتوو و خراپە لە چاو جومجومەی ئێمە ، ئەمەش تەنها بۆ ڕێگادان و پاساو بۆ ئەنجامدانی هەر هێرش و گرتنەبەری هەر کارێك بە شێوەیەکی یاسایی لە شەڕی دووەمی جیهانی.

**بۆ زياتر شارەزابوون و زانيارى زياتر ئەم سەرچاوانە بخوێنەوە:**

١-الله أكبر خربت امريكا: لأبي جندل الأزدي

٢- كتاب: أمريكا والإبادات الجماعية" لمنير العكش.

٣-الحمر والبيض والسود - جارى ناس - ترجمة مصطفى أبو الخير - سلسلة الألف كتاب - مصر- بتصرف.

٤- أمريكا والكنانيون الحمر - دراسة منشورة بمجلة أخبار الأدب - دمشق - ٢٠٠٢/٦/٩م - بتصرف

٥- كتاب "التنكيل بالعراق العقوبات والقانون والعدالة" لمؤلفه الإنجليزي جيف سيمونز

٦- (حقيقة الحرب الصليبية الجديدة) للشيخ يوسف العييري رحمه الله وتقبله في الشهداء.

٧- أرقامهم التي هزلت، لكاتب أمريكي(هنري دوبينز)

**سُبحانَك اللهُم وبِحمدكِ، أشْهدُ أن لااله إلا أنْت،أستَغفرك وأتُوب إلَيْك**

**ناوەڕۆك:**

